کرێکارانی جیهان یەکگرن!

# لودیفیگ فۆیەرباخ و
# کۆتایی
# فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی

پاشکۆی

مارکس: تێزەکان دەربارەی

فۆیەرباخ

**وەرگێڕانی/ سالار ڕەشید**







فۆیەرباخ

"مارکس و ئەنگڵس بە لێبڕاوەترین تەرز، داکۆکییان لە ماتریالیزمی فەلسەفی کردووە و چەندین کەڕەت ئەوەیان ڕۆشنکردۆتەوە کە، هەر جۆرە لادانێک لەم بنەمایانە، هەڵەیەکی گەورەیە. تێڕوانینەکانیان زۆر بە ڕۆشنی و بە درێژی لەو دوو پەڕاوەی ئەنگڵس: "لوڤیگ فۆێرباخ" و "ئانتی دۆهرینگ"، کە مانەندی "مانیفێستی کۆمۆنیست"، لە ڕیزی ئەو کتێبانەیە کە دەبێت هەردەم لە بەردەستی هەر کرێکارێکی وشیاردا بێت، خستۆتەڕوو."

لینین

# پێشەکی

کارڵ مارکس لە پێشەکی پەرتووکەکەی "دەربارەی ڕەخنە لە ئابووریی سیاسی", چاپی بەرلین ١٨٥٩, باسی ئەوە ئەکات کە چۆن لە ساڵی ١٨٤٥ لە برۆکسل, پێکەوە بڕیاری ئەوەماندا کە "هەردووك پێکەوە, تێڕوانینەکانمان"_ یانی تێگەییشتنی ماتریالیستانە بۆ مێژوو, کە بە شێوەیەکی سەرەکی لە لایەن مارکسەوە داڕێژران_ "بە پێچەوانەی تێڕوانینە ئایدیۆلۆژییەکانی فەلسەفەی ئەڵمانی دابڕێژین و لە ناوەڕۆکی کارەکەوە, حیسابی خۆمان, لەگەڵ ویژدانی فەلسەفیی پێشوومان, یەکلا بکەینەوە. ئەم نیازەی ئێمە, بە شێوەی ڕەخنەگرتن لەو فەلسەفەیەی کە لە پاش هیگڵ پەیدابوو, بە ئەنجام گەییشت. زۆر دەمێك بوو, دەسنووسەکە_ کە پێکهاتبوو لە دوو بەرگی گەورە, بە قەوارەی هەشتییەك_ گەییشتبووە جێگای چاپ, یانی وستفالیا, کاتێك ئێمەیان ئاگادارکردەوە, کە بە هۆی گۆڕانی هەلومەرجەکەوە, مەحاڵە پەرتووکەکە لە چاپ بدرێ. بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە بە مەبەستی سەرەکیمان_ کە ڕۆشنکردنەوەی مەسەلەکان بوو بۆ خۆمان_ گەییشتبووین, ئەوا بە خۆشحاڵییەوە, دەسنووسەکەمان خستە بەردەم ڕەخنەی مشکە کرتێنەرەکان.

لەو کاتەوە, چل ساڵ زیاتر تێپەڕیوە و مارکس کۆچی دوایی کردووە. بۆ هیچ یەکێکمان, ئەو هەلە نەڕەخسا, کە جارێکی تر بگەڕێینەوە سەر بابەتی ناوبراو. ئێمە هەڵوێستی خۆمان لە زۆر بۆنەدا, سەبارەت بە هیگڵ خستۆتە ڕوو, بەڵام ئەم کارەمان لە هیچ نووسراوەیەکدا بە تەواوی بە ئەنجام نەگەیاندووە. هەرچی دەربارەی فۆیرباخە, کە لە هەندێك لایەنی دیاریکراودا, ئەڵقەی پەیوەندی نێوان هیگڵ و تیۆرییەکەی ئێمەیە, بە هیچ





جۆرێك نەگەڕاوینەتەوە سەری. لەو ماوەیەدا, تێڕوانینی مارکس بۆ دنیا, لایەنگرانێکی لە دەرەوەی سنوورەکانی ئەڵمانیا و ئەورووپا و تەواوی زمانە ئەدەبییەکانی دنیا بۆ پەیدا بوو. لە لایەکی دیکەوە, فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی لە دەرەوەی ئەڵمانیا, بە تایبەت لە ئینگلتەرا و لە وڵاتە ئەسکاندیناڤییەکان, جۆرێك بوژانەوەی بە خۆی بینی. وەك دەرئەکەوێ, تەنانەت لە ئەڵمانیا, هەر هەموو ئەو چێشتە بێتامە ئیختیارییەیان پێئەگەیاند, کە لە زانکۆکاندا بە ناوی فەلسەفەوە پێشکەشیان دەکرا.

لەبەر ئەوە, هەتا ئەهات زیاتر, ئەوەم لە لا گەڵاڵە ئەبوو, کە چۆن تێڕوانینی خۆمان لەسەر فەلسەفەی هیگڵ, بە شێوەیەکی کورت و ڕێکوپێك, یانی چۆن لێیەوە دەسمانپێکرد و چۆن وازمان لێی هێنا, بخەمە ڕوو. هەروەها دەبێ بە تەواوەتی دان بەوەدا بنێم کە چۆن ئێمە قەرزارباری فۆیرباخین و چۆن لە سەردەمی تۆفان و هێرشدا (١), لە پاش هیگڵ, لە هەموو فەیلەسوفێکی دیکە زیاتر, کاریگەری گەورەی بەسەرمانەوە هەبوو. لەبەر ئەوە من زۆر بە خۆشحاڵییەوە, پێشنیاری دەستەی دەرهێنەری گۆڤاری نۆیێ تزایت (٢) "Neue Zeit"م قبوڵ کرد, کە ئەویش نوسینەوەی شیکردنەوەیەکی ڕەخنەگرانە لەو پەرتووکەی شتارکە کە لەسەر فۆیرباخ بوو. نووسینەکەم لە ژمارە چوارەم و پێنجەمی گۆڤاری ناوبراو لە ساڵی ١٨٨٦دا بڵاو کرایەوە و ئێستاش بە چاپێکی سەربەخۆ, کە پێیدا چوومەتەوە, بڵاو ئەکرێتەوە.

پێش ئەوەی ئەم دێڕانە بۆ چاپخانە بنێرم, دەسنووسە کۆنەکەی ساڵانی ١٨٤٥_ ١٨٤٦م[1] پەیداکرد و جارێکی تر دەورم کردەوە. لەم دەسنووسەدا,

[1] کارڵ مارکس و فریدریك ئەنگڵس, "ئایدیۆلۆژی ئەڵمانی". (وەرگێڕی عەرەبی).

ئەو بەشەی کە تایبەتە بە فۆیرباخ, تەواو نەکراوە. ئەو بەشەی کە تەواو کراوە, بریتییە لە شیکردنەوەی ماتریالیستانە بۆ مێژوو, ئەو شیکردنەوەیە بە تەنها ئەوە پیشان ئەدات کە تا چ ڕادەیەك زانیاریمان لەو سەرمەدا, لە بواری مێژووی

ئابووریدا ناتەواو بووە. بابەتی, ڕەخنە لە تیۆری فۆیرباخ لە دەسنووسەکەدا نییە, هەر بۆیە بۆ ئەم نووسینەم, ناتوانم پشتی پێ ببەستم. بەڵام لە یەکێك لە دەفتەرە کۆنەکانی مارکس, یانزە تێزەکەم, کە دەربارەی فۆیرباخە[٢], دۆزییەوە, کە لێرەدا بە شێوەی پاشکۆ, چاپ کراوە. ئەم تێزانە, تێبینیگەلێکن, کە بە خێرایی نووسراوون و بە هیچ جۆرێك بۆ بڵاوکردنەوە ئامادە نەکراوون, پێویستییان بە ڕێکخستن و دارشتنەوە هەیە. بەڵام بەهای ئەوانە, وەك یەکەمین بەڵگەنامەیەك, کە ناوکی بلیمەتی جیهانبینی نوێی لە خۆ گرتووە, لە ڕادە بەدەرە.

**فریدریك ئەنگڵس**

**لەندەن ٢١ شوبات ١٨٨٨**

ئەم پێشەکییە ف. ئەنگڵس, بۆ چاپێکی سەربەخۆی پەرتووکەکەی بە ناوی "لودڤیگ فۆیرباخ و کۆتایی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی", کە لە ساڵی ١٨٨٨ لە شتوتگارت بڵاوکرایەوە, نووسیوە.

---

[2] کارڵ مارکس, "تێزەکان دەربارەی فۆیرباخ" (بڕوانە ئەم چاپە). (و. عەرەبی).





## بەشی یەکەم: هیگڵ

ئەم پەرتووکەی[3] کە لە بەردەستماندایە, ئەمانگەڕێنێتەوە بۆ ڕۆژگارێك, کە لە ڕووی کاتەوە بە قەدەر یەك وەچە لە پاش ئێمەوەیە. بەڵام بۆ ئەم وەچەیەی کە ئێستا لە ئەڵمانیا ئەژین, بە جۆرێك بۆیان نامۆیە, وەك ئەوەی کە یەك سەدە نێوانیان بێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو قۆناغە قۆناغی خۆئامادەکردنی ئەڵمانیا بۆ شۆڕشی ١٨٤٨ بوو و هەرچییەك لە دوای ئەوەوە, لای ئێمە ڕوویدابێت, تەنها بەردەوامیی ساڵی ١٨٤٨ و جێبەجێکردنی ئەو ڕاسپاردانەیە, کە شۆڕش بەجێی هێشت.

لە ئەڵمانیای سەدەی نۆزدەیەم, هەر وەکوو فەرەنسای سەدەی هەژدەیەم, شۆڕشی فەلسەفی سەرەتایەك بوو بۆ شۆڕشی سیاسی. بەڵام چ جیاوازییەکی مەزن لە نێوان ئەو دوو شۆڕشە فەلسەفییەدا هەبوو! فەرەنسییەکان بە ئاشکرا لە بەرامبەر سەرتاپای زانستی فەرمی و کڵێسا و هەروەها زۆر جاریش لە بەرامبەر دەوڵەت, دەجەنگین, نووسراوەکانیان لەو دیو سنوور, لە هۆڵەندا و ئینگلتەرا چاپ ئەکران و بۆیە بە زۆریی خۆشیان ڕەوانەی باستیل ئەکرد. بەڵام ئەڵمانەکان بە پێچەوانەوە, مامۆستا و پەروەردەکارانی لاوان, لە لایەن دەوڵەتەوە دامەزرابوون, نووسراوەکانیان وەکوو پەرتووکی پەروەردە و فێرکردن دانی پێدا نرابوو, هەروەها ڕێبازی

[3] "Ludwig Feuerbach" Von C.N. Starcke, Dr. phil., Stuttgart, Ferd Encke, 1885. ("لودڤیگ فۆیرباخ", دانراوی ك. ن. شتارکە, دکتۆری فەلسەفە, بڵاوکردنەوەی فریدیناند ئانکە, شتوتگارت, ١٨٨٥). (تێبینی ئەنگڵس).





هیگڵ, کە تاجی تێکڕای پەرەسەندنی فەلسەفییە, بە ڕادەیەك بڵندکرایەوە کە بووە فەلسەفەی فەرمیی شاهەنشاهیی پروسی! لە پشت سەری مامۆستایانێکی لەو چەشنە و لە دەربڕینە نارۆشن و خۆبەزلزانینەکانیانەوە, لە ڕستە قورس و بێزارکەرەکانیانەوە, چۆن دەکرێت شۆڕش پەیدابێت؟! ئەوانەش کە لەو ڕۆژگارەدا, بە نوێنەری شۆڕش دائەنران, یانی لیبراڵەکان, ئایا سەرسەختترین دوژمنی ئەو فەلسەفەیە, کە نارۆشنی لە مێشکی مرۆڤ پێکئەهێنا, نەبوون؟ بەڵام ئەوەی کە نە دەوڵەت و نە لیبراڵەکان نەیان دەبینی, لانی کەم کەسێك, لە هەمان ساڵی ١٨٣٣دا, بە ناوی هاینریش هاینەوە (٣) دەیبینی.

با نموونەیەك بهێنمەوە. هیچ تێزێکی فەلسەفیی بە قەدەر ئەو تێزە بەناوبانگەی هیگڵ کە دەڵێت: "هەر واقیعییەك ماقوڵ و هەر ماقوڵێك واقیعییە", نەبۆتە جێگای ڕێزی دەوڵەتە کورتبینەکان و دانی پێدا نەنراوە و نەبۆتە جێگای غەزەبی ئەو لیبراڵانەی کە لە کورتبینیدا لەو دەوڵەتانە کەمتر نین.

ئەم تێزە بە ڕووکەش, پاساوێکە بۆ گشت ئەو شتانەی کە هەیە, فەلسەفەی ستەمکاری و ملهوڕی, دەوڵەتی پۆلیسی, دادگای پاشایەتی و سانسۆر پیرۆز ڕائەگرێت. فریدریك ولهیلمی سێیەم بەو جۆرە بیری ئەکردەوە, لایەنگرانیشی بەو جۆرە بیریان ئەکردەوە. بەڵام بەلای هیگڵەوە, هەر شتێك کە بوونی هەیە, بە هیچ جۆرێك, بە بێ قەید و شەرت, واقیعی نییە. واقیعیبوونی هەرشتێك, پەیوەستە بەوەی, کە لە هەمانکاتدا پێویستیش بێت.

"واقیعییەت, لە میانەی پەرەسەندنی خۆیدا, بە شێوەی پێویستیی دەرئەکەوێ".

لەبەر ئەوە, هیگڵ پێی وا نییە, کە هەر هەنگاوێکی دەوڵەت بە بێ چەندوچوون, شتێکی واقیعییە, خودی هیگڵ, بۆ نموونە, "یاسای باجی دیاریکراو" ی باس دەکرد. بەڵام ئەوەی کە پێویستییە, سەرئەنجام وەك ماقوڵ دەرئەکەوێ, بەم پێیە, ئەگەر ئەو تێزەی هیگڵ لەگەڵ دەوڵەتی پروسی ئەو سەردەمە بەکاربەرین, ئەوا تەنها ئەم مانایەی ئەبێت: ئەم دەوڵەتە بەو ڕادەیەی کە پێویستە, بە هەمان ڕادەش ماقوڵە و لەگەڵ ژیریدا جووت دێتەوە. ئەگەر بەم حاڵەوە, لە ڕوانگەی ئێمەوە ئەم دەوڵەتە گەندەڵە و سەرەڕای ئەو گەندەڵییەی, هەر درێژە بە عومری خۆی ئەدات, ئەوا پاساوی گەندەڵیی دەوڵەت, لە گەندەڵی دەستوپێوەندەوەیە. پروسییەکانی ئەو دەمە, دەوڵەتێکی وایان هەبوو, کە شایانی خۆیان بێت.

بەڵام واقیعییەت, لە دیدگای هیگڵەوە, بە هیچ جۆرێك سیفەتگەلێکی لەو جۆرە نییە, کە لە هەموو هەلومەرج و سەردەمێکدا, پاشکۆی سیستەمێکی سیاسیی وەیان کۆمەڵایەتی دیاریکراو بێت. بەڵکوو بە پێچەوانەوە, کۆماری ڕۆمانی واقیعی بوو, بەڵام ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیش کە کۆماریی لە مەیدان وەدەرنا, ئەویش دیسانەوە واقیعی بوو. هەروەها پاشایەتیی فەرەنسا لە ساڵی ١٧٨٩ بە ڕادەیەك ناواقیعی بوو. یانی بە ڕادەیەك کە پێویستیی مانەوەی بە هیچ جۆرێك نەمابووەوە و بە ڕادەیەك ناماقوڵ بوو, کە پێویست بوو شۆڕشی مەزن, کە هیگڵ هەمیشە بە شۆڕوشەوقێکی زۆرەوە باسی ئەکرد, بیڕوخێنێت. لەبەر ئەوە پاشایەتی لێرەدا ناواقیعیی, بەڵام شۆڕش واقیعی بوو. ڕێك بە هەمان شێوە, هەموو ئەو شتانەی کە لە ڕابردوودا واقیعیی بوون, لە ڕەوتی پەرەسەندندا, ئەبنە ناواقیعی و پێویستیبوون و مافی ژیانی خۆیان, هەروەها سیفەتی ماقوڵێتی, لەدەستئەدەن. واقیعەتی نوێ, کە بۆ ژیان بشێت, جێگای



واقیعەتی لەناوچوو ئەگرێتەوە, ئەگەر هاتوو کۆنەکە ژیر بوو, وە بە بێ بەرگریی, بە چارەنووسی خۆی ڕازی بوو, ڕێگایەکی ئاشتیانە و ئەگەریش لە بەرامبەر ئەم پێویستییەدا وەستایەوە, ئەوا ڕێگای توندوتیژی بەکاردەبرێت. بەو شێوەیە, ئەم تێزەی هیگڵ, لە ژێر تیشکی دیالێکتیکی خودی هیگڵ, بە دژی خۆی دەگۆڕێت: هەموو ئەو شتانەی کە لە مەیدانی مێژووی مرۆڤایەتیدا واقیعین, بە تێپەڕینی کات, لەگەڵ ژیریدا پێچەوانە دەبنەوە, بەم پێیە, هەموو واقیعەتێك, بە تەبیعەتی خۆی, ناماقوڵە و هەر لە سەرەتاوە مۆری ناماقوڵی بە خۆیەوە ناوە, هەروەها هەموو ئەوانەی کە لە مێشکی مرۆڤدا ماقوڵن, هەرچەندە لەگەڵ واقیعەتی بە ڕووکەش, دژایەتیشیان هەبێت, بڕیارە کە سبەی ڕۆژ بە واقیعەت بگۆڕێن. ئەو تێزەی کە دەڵێت, هەموو شتێکی واقیعی, ماقوڵە, بەپێی هەموو ڕێساکانی ڕێبازی هیگڵی, بۆ تێزێکی دیکە, کە ئەویش, هەر شتێك کە هەیە, شاییستەی پوکانەوەیە[4], ئەگۆڕێت. بەڵام لە هەمان کاتدا, گرنگیی واقیعی و مۆرکی شۆڕشگێڕانەی فەلسەفەی هیگڵ (کە پێویستە ئێمە لێرەدا, توێژینەوەکەمان بە دوا قۆناغی بزووتنەوەی فەلسەفی, کە لە سەردەمی کانتەوە دەستییپێکردووە, سنووردار بکەینەوە) لەوەدایە, کە فەلسەفەی هیگڵ, دواسنووری بۆ هەر جۆرە وێنایەك لە مەڕ دوا بەشی بەرهەمی بیر و کاری مرۆڤ, دانا. لە دیدگای هیگڵەوە, ئەوەی کە دەبێ فەلسەفە بیزانێت ئەوەیە کە, ڕاستیی, کۆمەڵە بڕوایەکی وەشکەڵاتوو و ئامادەکراو نییە, کە لە دوای دۆزینەوەی, ئەرکی مرۆڤ تەنها ئەوە بێت کە بچێت لەبەریان

4 گۆڕینی وشەکانی میفیستۆ لە کوێرەوەرییەکانی گۆتە "فاوست", بەشی یەکەم, پەردەی سێیەم ("نووسینگەی فاوست"). (و. عەرەبی).

بكات, بەڵكوو ئێستا ئیتر, شوێنی ڕاستیی, خودی پرۆسەی زانین و پەرەسەندنی مێژووی دووورودرێژی زانستە, زانستێك كە لە پلە نزمەكانی زانستەوە بۆ پلە بەرز و بەرزترەكانی هەڵدەكشێت, بەڵام هەرگیز, ناگاتە خاڵی بەناو, ڕاستیی ڕەها, كە ئیتر نەكرێ لەوە زیاتر مرۆڤ هەنگاوی زیاتر بنێ و كارێكی تری بۆ نەمابێتەوە, جگە لەوەی دەست بنێتە سەر دەست و لە نێو خەیاڵی جوانیی ئەو ڕاستییە ڕەهایەی كە بەدەستیهێناوە, بتوێتەوە. ڕەوەندەكە بەم جۆرەیە, چ لە مەیدانی مەعریفەی فەلسەفی, وەیان لە مەیدانی هەر مەعریفەیەكی دیكە و هەروەها لە مەیدانی چالاكی عەمەلیشدا. مێژووش بە هەمان شێوەی زانینە, هەرگیز لە حاڵەتێكی كامڵ و نموونەیی مرۆیی, بە سەرئەنجامێكی كۆتایی ناگات. كۆمەڵگای كامڵ و "دەوڵەتی" كامڵ, دوو شتن, دەكرێ بە تەنها لە دنیای خەیاڵدا بوونی هەبێت. بەڵام مەسەلەكە بە پێچەوانەوەیە, هەموو سیستەمە كۆمەڵایەتییەكان كە لە مێژوودا جێگای یەكتری دەگرنەوە, جگە لە قۆناغگەڵێكی كاتیی پەرەسەندنی كۆمەڵی مرۆیی, كە كۆتایی نییە, لە قۆناغێكی نزمەوە بۆ بەرز, شتێكی تر نییە. هەر قۆناغێكی پێویست, كە قەرزاربارى ئەو هەلومەرج و ڕۆژگارەیە كە تیایدا گەشەی كردووە, باش و پەسەندكراوە. بەڵام لە بەرامبەر ئەو هەلومەرجە نوێ و باڵاترەدا, كە پلە بە پلە لە هەناوی خودی خۆیەوە پەیدا ئەبێ و گەشە ئەكات, باشی و پەسەندێتی لە دەست ئەدات و جێگەی بۆ چۆڵ ئەكات. ئەم قۆناغە ناچار ئەبێ كە جێگا بۆ قۆناغێكی باڵاتر چۆڵ بكات, كە ئەویش لە نۆرەی خۆیدا, تووشی داماوی و لەناوچوون دەبێت. هەروەكوو چۆن بۆرژوازی, بە هۆی پیشەسازی گەورە و كێبەركێ و بازاڕی جیهانییەوە, تەواوی دامەزراوە لە مێژینە جێكەوتەكان, كە چەندین سەدەی دووورودرێژ پیرۆز ڕاگیرابوون,





تێكوپێك ئەشكێنێ, بە هەمان شێوە, ئەم فەلسەفەی دیالێكتیكە, تەواوی ئەو وێنایانەی كە باسی ڕاستی ڕەها و كۆتایی و هەلومەرجی مرۆڤایەتیی ڕەها كە جووتبێتەوە لەگەڵیاندا, ئەكات, تێكوپێك ئەشكێنێ. بەلای فەلسەفەی دیالێكتیكییەوە, هیچ شتێكی كۆتایی, ڕەها و پیرۆز, نییە. ئەم فەلسەفەیە پێی وایە, لەناوچوون, مەسەلەیەكی ناچارییە بۆ هەموو شتێك و هیچ شتێك جگە لە ڕەوتی بەردەوامی گەشە و نەمان و بڵندبوونەوەی بێ كۆتایی لە نزمەوە بۆ بەرز, توانای وەستانەوە لە بەرامبەریدا نییە. هەروەها بۆخۆشی, ڕەنگدانەوەیەكی سادەی ئەم پرۆسەیەیە لە هزری بیرمەنددا. ئەوە دروستە كە ئەم فەلسەفەیە لایەنی كۆنەپارێزانەشی هەیە, ئەویش بەو جۆرەی كە, وەك شتێكی باش و پەسەند, دەڕوانێتە هەر قۆناغێكی دیاریكراو لە پەرەسەندنی زانین و پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان لە هەلومەرج و سەردەمی خۆیدا, نەك زیاتر. كۆنەپارێزی ئەم شێوە تێگەیشتنە ڕێژەییە, بەڵام لایەنە شۆڕشگێڕییەكەی ڕەهایە_ ئەمە تەنها ڕەهایەكە كە فەلسەفەی دیالێكتیك پێی ڕازیی بێت.

ئێمە لێرەدا بە پێویستی نازانین لەو مەسەلەیە بكۆڵینەوە كە, ئایا ئەم شێوە تێگەیشتنە, لەگەڵ هەلومەرجی هەنووكەیی زانستییە سروشتییەكاندا بە تەواوی ڕێك دێتەوە, ئەو زانستانەی كە پێشبینی, ئەگەری لەناوچوونی گۆی زەوی و لەناوچوونی دانیشتوانەكەی بە دڵنیاییەكی ڕێژەییەوە, دەكات و بەپێی ئەم بنەمایە, پێی وایە كە مێژووی مرۆڤایەتیی, جوڵەیەكی ڕوو لەسەر نییە بە تەنها, بەڵكوو ڕوو لە خواریشە. بەڵام بە هەرحاڵ, ئێمە هێشتا لەو خاڵی وەرچەرخانەی كە, مێژووی كۆمەڵگا جوڵەی ڕوو لە خواری خۆی لێیەوە دەسپێئەكات, گەلێك دوورین و ناشێتیش ئەو چاوەڕوانییەمان لە فەلسەی هیگڵ هەبێت كە, گرنگی بە

مەسەلەیەك بدات كە زانستەكانی سرووشت هەتاوەكوو ئێستا لە دەستووری كاری خۆیاندا, دایان نەناوە.

بەڵام ئەوەی لێرەدا پێویستە باس بكرێت ئەوەیە كە, ئەو بۆچوونانەی لە سەرەوە لێی دواین, بەو شێوە لێبڕاوانەیەی ئێمە خستمانە ڕوو, هیگڵ نەیخستۆتە ڕوو. ئەوانە ئەنجامگیرییەكن كە ئەو ڕێبازەی ئەو بە ناچاری پێی دەگات, بەڵام خۆی هەرگیز بە ڕاشكاوییەكی لەو جۆرە, ئەم ئەنجامگیرییەی نەكردووە, ئەویش لەبەر هۆیەكی سادە, ئەویش ئەوەیە كە هیگڵ ناچاربووە سیستەمێك بنیات بنێت, سیستەمی فەلسەفیش بەپێی نەریتی باو هەر لە مێژەوە, ئەبێت بەم یان بەو ڕاستییە ڕەهایە كۆتایی بێت. هەروەها ئەوە خودی هیگڵیشە, بە تایبەت لە پەرتووك "لۆژییك"ەكەی خۆیدا, ئاماژە بەوە دەكات كە ئەم ڕاستییە نەمرە, جگە لە خودی پرۆسەی لۆژیكیی (بەمانایەكی تر: resp[5]: مێژوویی) شتێكی دی نییە, هیگڵ خۆی بە ناچار ئەزانێت كە كۆتاییەك بۆ ئەم پرۆسەیە دابنێت, چونكە سەرئەنجام ئەو, پێویستە فەلسەفەكەی, بە شێوەیەك لە شێوەكان, كۆتایی پێ بهێنێت. ئەو ئەتوانێت لە "لۆژیك"دا, لەو كۆتاییە سەرەتایەكی نوێ دەستپێبكات, چونكە خاڵی كۆتایی, یانی بیرۆكەی ڕەها_ كە تەنها لەبەر ئەوە ڕەهایە, چونكە ئەو هەرگیز ناتوانێت شتێكی لەبارەوە بڵێت_ لەوێدا خۆی "دەگوازێتەوە" (یانی ئەگۆڕێت) بۆ سرووشت, پاشان لە شێوەی ڕۆح_ یانی بیر و مێژوو_ دووبارە ئەگەڕێتە بۆ خۆی. بەڵام لە كۆتایی هەر فەلسەفەیەكدا, بۆ گەڕانەوەیەكی لەم چەشنە بۆ خاڵی لێوەهەستان, تەنها یەك ڕێگا ئەمێنێتەوە, ئەویش ئەوەیە كە پێویستە كۆتایی مێژوو بەم

[5] "Respective" (و. عەرەبی).



شێوەیە وێنا بكات: مرۆڤایەتیی, بە تەواویی, دەستی بە زانینی بیرۆكەی ڕەها ئەگات و ڕایدەگەیەنێت كە زانینی ئەم بیرۆكەی ڕەهایە, لە لایەن فەلسەفەی هیگڵەوە بەدەستهاتووە. بەڵام ئەمە مانای ئەوەیە كە هەموو ناوەڕۆكێكی وشكەڵاتووی سیستەمی هیگڵ وەكوو ڕاستییەكی ڕەها ڕابگەیەنین, كە ئەمەش ناكۆكە لەگەڵ شێوازە دیالێكتیكییەكەی خۆی, كە هەموو شتێكی وشكەڵاتوو وێران ئەكات. ئەمە یانی, خنكاندنی لایەنی شۆڕشگێڕیی لە ژێر فشاری لایەنی لە ڕادەبەدەر هەڵاوساوی كۆنەپارێزانە, نەك لە مەیدانی زانینی فەلسەفی بە تەنها, بەڵكوو لە بواری پراكتیكی مێژووییشدایە. مرۆڤایەتی كە بە هۆی هیگڵەوە بە بیرۆكەی ڕەها گەییشت, پێویستە لە مەیدانی پراكتیكیشدا تا ئەو ئاستە بچێتە پێش كە بتوانێت, گۆڕینی ئەم بیرۆكەی ڕەهایە بۆ واقیعەت, فەراهەم بكات. بەم پێیە, بیرۆكەی ڕەها پێویستی نە ئەكرد بۆ هاوچەرخەكانی, خواستی سیاسی زۆر مەزن پێشكەش بكات. لەبەر ئەم هۆیە, ئێمە لە كۆتایی "فەلسەفەی مافەكان"دا ئەوەمان بۆ دەرئەكەوێ كە پێویستە بیرۆكەی ڕەها لە ژێر سایەی پاشایەتیی پایەپایەییدا, كە فریدریك ویلهیلمی سێیەم, پەیمانی بە دەستوپێوەندەكانی ئەدا و پێی لەسەر دائەگرت, بەڵام بەجێی نە ئەگەیاند, بە ئەنجام بگات, یانی لە ژێر سایەی دەسەڵاتی چینە دەسەڵاتدارەكان, دەسەڵاتی ناڕاستەوخۆی سنووردار, مامناوەندی, كە لەگەڵ پەیوەندییەكانی وردەبۆرژوازی ئەو دەمەی ئەڵمان ڕێك دێتەوە. هەروەها هەوڵ ئەدرێت كە ناڕاستەوخۆ, پێویستیبوونی چینە نەجیبزادەكانمان بۆ بسەڵمێنن.

بە هەمان شێوە, تەنها پێویستییە دەروونییەكانی سیستەمە, بە ڕادەی پێویست, ئەوە ڕۆشن ئەكاتەوە كە بۆچی شێوازێكی بیركردنەوەی لە ڕادەبەدەر شۆڕشگێڕانە, بە ئەنجامگیرییەكی سیاسیی زۆر ئاشتیانە ئەگات.





بەڵام شێوەی تایبەتی ئەم ئەنجامگیرییە بێگومان, ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هیگڵ ئەڵمانی بووە و وەکوو گۆتەی هاوچەرخی, بە ڕادەیەکی بەرچاو, کورتبینی وردەبۆرژوازی بەسەردا زاڵبووە. گۆتەش هەروەکوو هیگڵ, هەر یەکەیان لە مەیدانی خۆی, بە تەواوی مانا, زێوسی ئۆلۆمپی (٤) واقیعی بوون, بەڵام نە یەکەمیان و نە دووەمیان, نەیانتوانی بە تەواوی, خۆیان لە کورتبینی وردەبۆرژوازی ئەڵمانی ڕزگار بکەن.

بەڵام ئەمە ڕێگەی لەوە نەگرت کە سیستەمی هیگڵ, مەیدانگەلێك بگرێتەوە, بە بەراورد لە تەك تەواوی سیستەمەکانی پێشینی خۆی, گەلێك فراوانتر بێت و لەم مەیدانەدا, سەروەتێکی فیکری وەها بەدەستبهێنێ کە, هەتاوەکوو ئێستاش سەرمان لێی سووڕبمێنێ. هیگڵ لە فینۆمینۆلۆژی ڕۆح (کە ئەکرێت لەگەڵ زانستی کۆرپەلەناسی و کاهینناسی ڕۆح بەرابەر دابنرێت, پەرەسەندنی هەستی فەردیی لە قۆناغە جیاجیاکانیدا, بە کورتکراوەی ئەو قۆناغانە دەچوێنرێت کە لە ڕووی مێژووییەوە هەستی مرۆیی پیایدا تێپەڕیوە.), لە لۆژیك, لە فەلسەفەی سرووشت, لە فەلسەفەی ڕۆح کە لە لقە مێژووییە فراوانەکانیدا, یانی فەلسەفەی مێژوو, ماف, ئایین, مێژووی فەلسەفە و جوانناسیی و ...هتد. ڕۆشن کراوەتەوە,_ هیگڵ هەوڵ ئەدات, لە هەر مەیدانێك لەو مەیدانە مێژووییە جۆراوجۆرانەدا, ئەو هێڵی پەرەسەندنە کە لە نێو ئەو مەیدانەوە گوزەرئەکات, بدۆزێتەوە و دەسنیشانی بکات. هەروەها لەبەر ئەوەی هیگڵ نەك هەر بلیمەتێکی داهێنەر, بەڵکوو زۆر دانا و خاوەن زانیاری و زانستێکی زۆر فراوان بوو, هەر بۆیە کارەکانی ئەو, لە هەر شوێنێك کە پێی هەستابێت, سەردەمێکی بە تەواوی هێناوەتەکایەوە. ئەوەش بۆخۆی





ڕۆشنە کە پێویستییەکانی "سیستەم", لە زۆر لایەنەوە ناچاری کردووە کە لێرەدا پەنا بۆ داڕشتنی دروستکراو بەرێت, کە تا ئێستاش نەیارە بێ ئابڕووەکانی, لەو بارەیەوە لە ڕادەبەدەر هاتووهاواریانە. ئەگەر کەسێك بێهوودە خۆی بە تەماشاکردنی ئەو داڕشتنانەوە خەریك نەکات و بچێتە قوڵایی ئەو تەلارە مەزنەوە, گەنجینەیەکی یەکجار زۆری بەرچاوئەکەوێت, کە هەتاوەکوو ئێستا بەهای خۆی بە تەواوی پاراستووە. بەلای گشت فەیلەسوفەکانەوە, شتێك کە لەنێودەچێت "سیستەم"ە, ئەمەش چونکە سیستەمەکان لە پێویستیی ڕۆحی مرۆییەوە کە لەناوناچێت, یانی پێویستی زاڵبوون بەسەر تێکڕای ناکۆکییەکان, سەرچاوەی گرتووە. بەڵام ئەگەر بە یەکجاریی, ناکۆکییەکان گشت لابران, ئەوا ئێمە بە حەقیقەتی بە ناو ڕەها ئەگەین و مێژووی جیهان کۆتایی پێ دێت, بەڵام لە هەمان کاتدا پێویستە لەسەری کە بەردەوام بێت, تەنانەت ئەگەر کارێکیش نەمابێتەوە بۆ ئەوەی ئەنجامی بدات. بەو جۆرە ناکۆکییەکی تازە سەرهەڵئەدات, ناکۆکییەك کە توانای چارکردنی نییە. چاوەڕوانییەك کە لە فەلسەفە ئەکرێ, کە بێت هەموو ناکۆکییەکان چارەسەر بکات, وەك ئەوەیە, داوا لە فەیلەسوفێك بکرێت کارێك ئەنجام بدات, کە تەنها, تێکڕای مرۆڤایەتی, لە ڕەوتی پەرەسەندنی ڕوو لە پێشی خۆیدا, ئەتوانێت ئەنجامی بدات. کاتێك کە پەی بەم خاڵە ئەبەین_ کە ئێمە لەوەدا, لە هەر کەسێکی کە زیاتر, قەرزارباری هیگڵین_ سەردەمی هەرجۆرە فەلسەفەیەك, بە مانا کۆنەکەی ئەم وشەیە, کۆتایی پێ دێت. ئێمە "حەقیقەتی ڕەها" کە لە ڕووی پرانسیپەوە هیچ کەسێك بە تەنها, لەم ڕێگایەدا, ناتوانێت دەستی پێ بگات, بەجێ ئەهێڵین و لە بریی ئەوە, لە ڕێگەی زانستە جێکەوتەکان و بەگشتیکردنی ئەنجامگیرییەکانیان بە هۆی دیدگای دیالێکتیکییەوە,

بکەوینە شوێن حەقیقەتی ڕێژەیی، کە دەکرێ دەستمان پێی ڕابگات. فەلسەفە بە شێوەیەکی گشتیی، لەگەڵ هیگڵ کۆتایی پێ دیت، چونکە لە لایەکەوە، ڕێبازەکەی هیگڵ بەرئەنجامێکی مەزنە، لە گشت ئەو پەرەسەندنانەی کە لە ڕابردوودا فەلسەفە بە خۆیەوە بینیویەتی و لە لایەکی ترەوە، خودی هیگڵ ئەگەرچی بێئاگایانە بووە، ڕێگەیەکمان نیشان ئەدات کە لە تەنگەبەرییە پڕ پێچ و پەناکانی سیستەمەکان بێینە دەر و ڕووە و مەعریفەی واقیعیی جێکەوتووی جیهان هەنگاو بنێین.

دژوارییەك لەوەدا نییە مرۆڤ درك بەوە بکات کە، سیستەمی هیگڵ لە ژینگەی ئەڵمانیای ئالوودەبوو بە فەلسەفە، ئەبێت چ کاریگەرییەکی مەزنی هەبێت. ئەوە مارشێکی سەرکەوتوو بوو کە دەیان ساڵی خایاند و هەرگیز، بە مەرگی هیگڵ کۆتایی نەهات. بەڵکوو بە پێچەوانەوە، دەسەڵاتی ڕەهای "هیگڵیزم"، بە تایبەت لە ساڵەکانی نێوان ١٨٣٠ بۆ ١٨٤٠، گەییشتە ئەوپەڕی، تەنانەت دوژمنەکانیشی کەم تا زۆر دانیان پێدا ئەهێنا. لەو ساڵانەدا بە تایبەت، بە شێوەیەکی ئاگایانە وەیان بێئاگایانە، تیۆرییەکانی هیگل بە شێوەیەکی فراوان لە زانستە جۆراوجۆرەکاندا بەکار ئەهێنرا، تەنانەت بووە هەوێنی بڵاوکراوە سادەکان و چاپکراوەکانی ڕۆژیش کە، "ڕۆشنبیران" ی مامناوەندی، کردبوویانە سەرچاوەی زەخیرەی تێڕوانینەکانیان. بەڵام ئەم سەرکەوتنە لە تەواوی مەیدانەکاندا، جگە لە سەرەتایەك بۆ جەنگی ناوخۆیی، شتێکی تر نەبوو.

تیۆری هیگڵ بە شێوەیەکی گشتیی، هەروەکوو بینیمان، مەیدانێکی فراوانی بۆ تیۆرەکانی پراکتیکی حیزبیی زۆر لێك جیاواز بەجێهێشت. بەڵام لە زیندەگی تیۆری ئەو دەمەی ئەڵمانیا، لە پێش هەر شتێکی دی، دوو شت جێبایەخی پراکتیك بوون: ئاین و سیاسەت. هەر کەسێك زیاتر





نرخی بۆ سیستەمەکەی هیگڵ دانا، ئەوا لە هەر یەکە لەو دوو مەیدانە ئەشێ، تاڕادەیەکی زۆر، کۆنەپارێز بێت. بەڵام ئەو کەسەی میتۆدی دیالێکتیك بە شتێکی سەرەکی دائەنێ، ئەشێ چ لە سیاسەت چ لە ئایین، بکەوێتە نێو توندڕەوترین ئۆپۆزیسیۆنەوە. خودی هیگڵ، سەرباری لە ئارادابوونی چەخماخەی زۆری تووڕەیی شۆڕشگێڕانە لە دانراوەکانیدا، بە شێوەیەکی گشتی، مەیلی بۆ لایەنە کۆنەپارێزەکە هەیە: سیستەمەکەی هیگڵ، گەلێك زیاتر لە میتۆدەکەی "کاری فیکریی سەنگین" ی بەسەر هیگڵدا سەپاندووە. نزیك بە کۆتایی سییەکان، قوتابخانەی هیگڵیی، گەلێك ڕۆشنتر لە پێشا، پارچەپارچەبوونی لێ دەرکەوت. ئەوانەی کە پێیان دەگوترا هیگڵییە لاوەکان- باڵی چەپ – وەردەووردە لە تێکۆشانیان لە دژی پیەتیستە ئەرتەدۆکسەکان (٥) و کۆنەپەرستانی فیۆدال، دەستیان لە هەڵوێستی فەلسەفیی خۆبەزلزانانە لە بەرامبەر مەسەلە گەرمەکانی ڕۆژ، ئەو هەڵوێستەی کە لە سۆنگەی ئەوەوە، لە لایەن دەوڵەتەوە مۆڵەت بە تیۆرییەکەیان درابوو و تەنانەت پارێزگاریشیان لێ دەکرا، دەستئەکێشنەوە. کاتێك کە لە ساڵی ١٨٤٠ ڕیاکاریی ئەرتەدۆکسی و کۆنەپەرستیی فیۆداڵی سەرکوتگەر لە کەسایەتیی فریدریك ویلهیلمی چوارەمدا گەییشتە سەر تەختی پاشایەتیی، وای پێویست ئەکرد کە، لایەنگریی بۆ ئەم حیزب یان ئەوی تر، بە ئاشکرا و بە دەنگی بڵند ڕابگەیەنرێ. جەنگێن هەروەکوو پێشا، بە چەکی فەلسەفیی، بە ئەنجام ئەگات، بەڵام ئەم جارەیان، لە پێناوی ئامانجی رووتی فەلسەفییدا نییە. قسەوباسەکان ڕاستەوخۆ دەربارەی تێکشکاندنی ئایینی میراتیی و ئەو دەوڵەتەی لە ئارادایە، بوون. ئەگەر دوا ئامانجە کردارەکییەکان لە "Deutsche Jahrbücher" (دۆیتشە

یاربیوخێر) (٦), زۆرجار لە ژێر پەردەی فەلسەفیدا خۆی نماییش ئەکرد, ئەوا لە بریی ئەوە, ئامۆژگاریی هیگڵییە لاوەکان لە " Rheinische Zeitung" (ڕاینیشە تزایتونگ) (٧) لە ساڵی ١٨٤٢دا, ڕاستەوخۆ فەلسەفەی بۆرژوا ڕادیکاڵی پەرەگرتوو بوو, ئەو پەردە فەلسەفیەش کە خۆیان لێوە پێچابوو, تەنها بۆ چاوبەستەکێی سانسۆرچییان بوو.

بەڵام ڕێگای سیاسەت لەو دەمەدا زۆر سەخت بوو, بۆیە خەباتی سەرەکی ڕووی لە ئایین بوو. خەبات لە دژی ئایینیش لەو دەمەدا, بە تایبەت لە ساڵی ١٨٤٠وە, بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ خەباتێکی سیاسی بوو. پەڕاوەکەی شتراوس بە ناوی "ژیانی مەسیح" کە لە ساڵی ١٨٣٥دا بڵاوکرایەوە, یەکەمین تەکانێك بوو لەو بارەوە. پاشان برۆنۆ باوێر لە دژی تیۆری پەیدابوونی ئەفسانەکانی ئینجیل, کە لەو پەڕاوەدا باسکراوە, وەستایەوە و هەوڵی دا ئەوە بسەلمێنێ کە, ژمارەیەکی زۆری چیرۆکەکانی ئینجیل, لە لایەن خودی دانەرانی ئینجیلەکانەوە دروستکراوون. مشتومڕی نێوان شتراوس و باوێر لە شێوەی خەباتی فەلسەفی, لە نێوان "خودئاگایی" و "جەوهەر"دا خۆی بینییەوە. مەسەلەی چۆنیەتیی پەیدابوونی چیرۆکەکانی ئینجیل سەبارەت بە موعجیزە, یانی, ئایا ئەم چیرۆکانە لە ڕێگای دروستکردنی ئەفسانە و بە شێوەیەکی نا ئاگایانە بەپێی نەریتێك کە باوبووە, لە دەروونی کۆمۆنەکانەوە سەریانهەڵداوە, یان دانەرانی ئینجیلەکان دایانهێناوون, مەسەلەی مەعریفەی بەرەو ئەوە پەلکێش کرد کە: هێزی بزوێنەری سەرەکیی مێژووی جیهان کامەیە, "جەوهەر"ە وەیان"هەست". لە کۆتاییدا شتیرنەر پەیدابوو, کە پەیامبەری ئەنارشیزمی هاوچەرخە_ کە باکۆنین زۆر شتی لەوەوە وەرگرتووە_ و بە هێنانەمەیدانی



"تاقانە" ی خاوەن سەروەریی خۆی, "هەست"ی خاوەن سەروەریی تێپەڕاند (٨).

ئێمە لێرەدا درێژە بەو لایەنە لە ڕەوتی شیبوونەوەی قوتابخانەی هیگڵیی نادەین. ئەوەی زیاتر بۆ ئێمە گرنگە ئەوەیە کە: پێویستییە کردارەکییەکانی تێکۆشان لە دژی ئایینی جێکەوتە, پاڵی بە ژمارەیەکی زۆری ئەو هیگڵییانەی کە خاوەن باوەڕێکی زۆر پتەو بوون, نا, کە بەرەو ماتریالیزمی ئینگلیزی و فەرەنسی بڕۆن. لەو دەمەوە ئەوانە, کەوتنە نێو بەربەرەکانیکردنی سیستەمی قوتابخانەکەی خۆیانەوە. لە کاتێکدا سروشت بە لای ماتریالیزمەوە تاکە مەسەلەی واقیعییە, لە سیستەمی هیگڵدا, بێجگە لە "گواستنەوە" ی بیرۆکەی ڕەها یانی پاشەکشەی بیرۆکە, شتێکی تر نییە, بە هەرحاڵ, بیرکردنەوە و بەرهەمی بیرکردنەوەش, یانی بیرۆکە, لەم سیستەمەدا شتی یەکەمە و سرووشت کە لێیانەوە وەدەرهاتووە, تەنها بە خێری ئەوەی کە بیرۆکە تا ئەو شوێنە پاشەکشەی کردووە, بوونی هەیە. هیگڵییە لاوەکان, لە نێو ئەم ناکۆکیانەدا, بە شێوەی جۆراوجۆر سەرگەردان بوون.

لەو کاتەدا دانراوەکەی فۆێرباخ بە ناوی "کرۆکی مەسیحییەت" (٩) بڵاوکرایەوە, بە یەك پیاکێشان ئەو ناکۆکییەی لەناوبرد و سەرکەوتنی ماتریالیزمی, سەرلەنوێ و ڕاشکاوانە ڕاگەیاند. سروشت سەربەخۆ لە هەر فەلسەفەیەك بوونی هەیە. سروشت ئەو بناغەیەیە کە ئێمەی مرۆڤ خۆمان بەرهەمی ئەوین و لەسەر ئەو بناغەیە نەشونمامان کردووە. لە دەرەوەی سرووشت و مرۆڤ شتێك نییە, هەرچی ئەو زیندەورانەی ئاسمانە کە لە خەیاڵی ئایینیی ئێمەوە لەدایك بوونە, جگە لە ڕەنگدانەوەی خەیاڵیی خودی بوونی خۆمان شتێکی تر نییە. بەو شێوەیە تەلیسمەکە وردووخاش





کرا, "سیستەم"ەکە تێکدرا و خرایە لاوە, ناکۆکییەکەش, تەنها بە دۆزینەوەی ئەو واقیعە سادەیەی کە, ئەم ناکۆکییە جگە لەوەی لە خەیاڵی ئێمەدایە بوونێکی تری نییە, چارەسەر بوو. پێویستە مرۆڤ کاریگەریی ڕزگاریبەخشی ئەم پەڕاوە هەست پێ بکات, تاوەکوو بیرۆکەیەکی لەو جۆرە بەدەستبهێنێ. شۆڕوشەوق و وروژانەکە هەموو لایەکی گرتەوە: هەموومان یەکسەر بووینە فۆێرباخیی. مرۆڤ دەتوانێت بە خوێندنەوەی "خێزانی پیرۆز" بۆی دەربکەوێ, کە مارکس سەرباری هەر تێبینییەکی ڕەخنەگرانەی, بە چ شۆڕوشەوقێکەوە پێشوازیی لەم تیۆرە نوێیە کرد و تا چ ڕادەیەك کاری تێی کرد.

تەنانەت کەموکوڕییەکیش کە لە پەڕاوەکەی فۆێرباخدا هەبوو, لەو دەمەدا, کاریگەریی فۆێرباخی بەهێز ئەکرد. شێوازی ئەدەبیی فۆێرباخ, کە لە هەندێك شوێن درووستکراو بوو, خوێنەرێکی زۆری بۆخۆی بەکێش ئەکرد, بە هەر حاڵ ئەمە, لە پاش ساڵانێکی دورودرێژی باڵادەستیی هیگڵێزمی موجەڕەد و تەماویی, سروەیەکی ڕەوانبەخش بوو. پێویستە هەمان شت, لەسەر بەخوداوەندکردنی خۆشەویستی بە شێوەیەکی لەڕادەبەدەر, بڵێین. ئەگەر ئەم بەخوداوەندکردنە پاساوێکیشی نەبێت, ئەکرێ ئەوە بکرێتە بیانوو کە, ئەمە وەك پەرچەکردارێك لە دژی زەبروزەنگ و دەسەڵاتی "بیرکرنەوەی پەتیی", کە بە هیچ کلۆجێك, توانای بەرگەگرتنی نەئەکرا, پیشان بدرێت. بەڵام ئەبێ ئەوەمان لە یاد نەچێ کە, "سۆسیالیزمی ڕاستەقینە" بە تەواوی, خۆی بەو دوو لایەنە لاوازەی دیدگای فۆێرباخەوە هەڵواسی, ئەو "سۆسیالیزم"ەی کە لە ١٨٤٤ەوە لە ئەڵمانیا, هەروەکوو پەتایەك لە ناوەندی "ڕۆشنبیران"دا تەشەنەی کرد, ئەو "سۆسیالیزم"ەی کە تیایدا, ڕستەی ئەدەبی, جێگەی لێکۆڵینەوەی زانستی





و ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی بە هۆی "خۆشەویستی", جێگەی ڕزگارکردنی پرۆلیتاریا لە ڕیگای ئاڵوگۆڕی ئابووری بەرهەمهێنانی, دەگرتەوە, بە کورتییەکەی بڵێین, نوقمی بێزراوترین جۆرەکانی گفتاری ئەدەبی و چەنەبازیی سۆزی خۆشەویستی ببوو. بەڕێز کارڵ گرون نوێنەرێکی نموونەیی ئەم ڕەوتە بوو.

پێویستە ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە قوتابخانەی هیگڵیی هەڵوەشایەوە, بەڵام ڕەخنەگرتن لە فەلسەفەی هیگڵی هێشتا, سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. شتراوس و باوێر هەر یەکەیان لایەنێك لە لایەنەکانییان بەدەستەوە گرتبوو, کە بە وێنەی چەکی پلمیك لە دژی یەکتر بەکاریان دەبرد. فۆێرباخ سیستەمەکەی تێکشکاند و بە سانایی خستییە پەراوێزەوە. بەڵام ڕاگەیاندنی ئەوەی کە ئەم فەلسەفەیە, فەلسەفەیەکی هەڵەیە, مانای ئەوە نییە کە ئیتر بەسەریدا زاڵبوویتە. ئەوەش مەحاڵە کە تەنها بە هۆی گوێنەدانەوە, کارێکی ئەوەندە مەزن, وەکوو فەلسەفەی هیگڵی, کە لە پەرەسەندنی ڕۆحیی میللەتێکدا, کاریگەرییەکی گەورەی داناوە, بخرێتە کەنارەوە. پێویستە فەلسەفەی هیگڵیی, بە مانای تایبەتیی خۆی "بڵند" بکرێتەوە, یانی ئەرکی ڕەخنەیە کە شێوەکەی تێکبشکێنێ و ناوەڕۆکێکی تازەش کە ئەو بەدەستی هێناوە, ڕزگار بکات. دواتر ئەبینین کە ئەم مەسەلەیە بە چ شێوەیەك چارەسەر کراوە.

بەڵام لەم نێوەدا, شۆڕشی ١٨٤٨, ڕێك بە هەمان بێپەروایییەك کە چۆن فۆێرباخ هیگڵی خستە کەنارەوە, گشت جۆرە فەلسەفەیەکی خستە کەنارەوە. لە هەمان کاتدا, خودی فۆێرباخیشی خستە دواوە.

## بەشی دووەم: ماتریالیزم

مەسەلەی بنەڕەتی گەورە لە گشت فەلسەفەیەك، بە تایبەت لە فەلسەفەی هاوچەرخدا، بریتییە لە مەسەلەی، پەیوەندی نێوان فیکر و بوون. هەر لە کۆنترین چاخەکانەوە، لەو کاتەوە کە مرۆڤ هێشتا بچووکترین زانیاریی دەربارەی پێکهاتەی لەشی خۆی نە دەزانی و نەی ئەتوانی لێکدانەوەیەك بۆ خەوبینین بکات[6]، بەو بڕوایە گەیشتووە کە، سەرچاوەی فیکر و هەستی، خودی لەشی نییە، بەڵکوو ئەو ڕۆحەیە کە لەو لەشەدا جێگیر بووە و لە پاش مردن بەجێی ئەهێڵێ،_ لەو کاتەوە ئیتر ئەبوو، بیر لە پەیوەندی نێوان ئەو ڕۆحە و جیهانی دەرەوە بکاتەوە. ئەگەر ڕۆح لە کاتی مەرگ لە جەستە جیا ئەبێتەوە و درێژە بە ژیان ئەدات، ئەوا هیچ هۆیەك لە ئارادا نییە تاوەکوو بە مەرگێکی تایبەتی بۆ ڕۆح، ڕازی بین. بەو شێوەیە بیرۆکەی نەمریی ڕۆح سەری هەڵدا، کە لەو پلەیە لە پەرەسەندن، مایەی هیچ سەرەخۆشییەك نەبوو، بەڵکوو بە وێنەی چارەنووسێکی ناچاریی دەهاتە پێش چاو، کە زۆر جار، هەروەکوو لای گریکەکان، بە بەڵایەکی واقیعی دەژمێردرا. ئەوە پێویستییەکی ئایینی بۆ سەرەخۆشی نەبوو، کە لە

[6] تا هەنووکە، بەلای مرۆڤی درندە و بەربەرەکانەوە، ئەوانەی کە لە نزمترین ئاستی شارستانیدان، ئەو بڕوایە زۆر بڵاوە کە، وێنەی کەسانێك کە لە خەودا ئەیانبینن بریتیین لەو ڕۆحانەی کە بۆ ماوەیەکی کاتی لەشەکان بەجێ ئەهێڵن، بەو شێوەیە مرۆڤە واقیعییەکە، لە بەرامبەر هەر ڕەفتارێك کە کەسی خەوتوو لە خەونەکەیدا بینیویەتی، لێپرسراوە. ئەم مەسەلەیە بۆ نموونە، ئیمتورن لە ساڵی ١٨٨٤، لە لای هیندییە سوورەکان لە گویان، تێبینی کردووە.



هەموو جێگەیەك بووە هۆی هێنانەکایەوەی خەیاڵی بێزارکەری نەمریی کەسەکان، بەڵکوو ڕاستییەکی سادە بوو، کە ئەویش بریتی بوو لەوەی، پاش قبووڵکردنی ڕۆح لە لایەن مرۆڤەوە، بەهۆی بیرتەسکی بیرکردنەوەی گشتییەوە، بە هیچ جۆرێك مرۆڤ نەی ئەتوانی ئەوە بۆ خۆی ڕۆشن بکاتەوە کە، لە پاش مردنی جەستە، ڕۆح بۆ کوێ ئەچێت. ڕێك بەم شێوەیە، لە میانەی دیاریکردنی هێزەکانی سروشتدا، یەکەمین خوداکان کە لە ڕەوتی پەرەسەندنی دواتری ئایین، زیاتر و زیاتر، وێنەی هێزەکانی دەرەوەی سروشتی بە خۆوە گرت و هەتا لە کۆتاییدا و لە مێشکی مرۆڤ و لە ئەنجامی پرۆسەی تەجریددا- خەریکبوو بڵێم: پرۆسەی دڵۆپاندن- کە لە ڕەوتی پەرەسەندنی مێشکدا، شتێکی زۆر سروشتییە، لە فرەخوداییەوە، کە خاوەن دەسەڵاتێکی سنوورداری تا ئەم ڕادەیە یان تا ئەو ڕادەیەیە، کە هەندێکیان، هەندێکی تریان دیاری ئەکەن، چەمکی خودای تاکوتەنیا و ڕەهای ئایینە یەکتاییەکان پەیدا بوو.

بەم پێیە، ڕیشەی بەرزترین مەسەلەیەك لە تەواوی فەلسەفەدا، مەسەلەی پەیوەندی نێوان فیکر و بوون، ڕۆح و سرووشت، بۆ ئەو وێنا سنووردار و تەماوییانەی کە لە لای مرۆڤ لە سەردەمی دڕندەییدا هەبووە، کە هیچی لە ڕیشەی هەر ئایینێك لەم وێنایانەدا کەمتر نییە، ئەگەڕێتەوە. بەڵام ئەم مەسەلەیە کاتێك توانی بەوپەڕی هێزەوە خۆی بنوێنێ و تەواوی گرنگی خۆی وەربگرێ کە، خەڵکی ئەورووپا لە خەوی سڕبووی دوورودرێژی سەدەکانی ناوەڕاستی مەسیحیەت بێدار بووەوە. مەسەلەی پەیوەندی فیکر بە بوون- مەسەلەی ئەوەی کە ڕۆح لە پێشە و یەکەمە یان سرووشت- ئەو مەسەلەیەی کە لە فەلسەفەی سکۆلاستیکی سەدەکانی ناوەڕاستیشدا، ڕۆڵی گرنگی گێڕا و لە بەرامبەر کەنیسەدا شێوەیەکی توندی بە خۆوە گرت

و بەم جۆرە خۆی نواند: ئایا جیهان لە لایەن خوداوە ئافرێندراوە, یان هەر لە ئەزەلەوە هەبووە؟

فەیلەسوفەکان بە پێی وەڵامێك کە بەم پرسیارەی ئەدەنەوە, بەسەر دوو ئۆردووگای گەورەدا دابەش ئەبن. ئەوانەی کە جەخت لەسەر ئەوە ئەکەنەوە کە, ڕۆح لە پێش سرووشتەوەیە, ئەوانەی دواتر و سەرەنجام, بەم شێوەیە یان بەوی تر, دانیان بە ئافراندنی جیهاندا نا (ئەبێ ئەوە بڵێین کە لەلای فەیلەسوفەکان, بۆ نموونە لەلای هیگڵ, ئافراندنی جیهان, زۆر جار شێوەیەکی ئاڵۆزتر و نا باوتریان وەك لە مەسیحییەت, بە خۆیانەوە گرتووە), ئۆردوگای ئایدیالیستی پێکئەهێنن. بەڵام ئەوانەی کە پێیانوایە, سرووشت بنەڕەتییە, ئەوا سەربە قوتابخانە جۆراوجۆرەکانی ماتریالیزمن.

ئەم دوو دەستەواژەیە: ئایدیالیزم و ماتریالیزم, جگە لەم مانایە هیچ شتێکی دی نییە و بەکارهێنانیشی لێرەدا, تەنها بەو مانایەیە. دواتر ئەبینین, کاتێك کە مانایەکی تر بەسەر ئەم دەستەواژانەدا ئەدەن, چ ناڕۆشنییەك دێتەکایەوە.

بەڵام مەسەلەی پەیوەندی نێوان فیکر و بوون, ڕوخسارێکی تریش لە خۆ دەگرێت: پەیوەندی نێوان بیرکردنەوەکانمان سەبارەت بە جیهانی دەوروبەرمان و خودی ئەم جیهانە چییە؟ ئایا بیرکردنەوەی ئێمە لە توانایدایە کە جیهانی واقیعی بناسێت, ئایا لە وێنا و چەمکەکانمان لە مەڕ جیهانی واقیعی, ئەتوانین ڕەنگدانەوەیەکی ڕاستگۆیانە و واقیعی بەدەست بهێنین؟ ئەم مەسەلەیە لە زمانی فەلسەفیدا, بە مەسەلەی جووتهاتنەوەی فیکر و بوون ناو دەبرێت. زۆربەی فەیلەسوفە گەورەکان وەڵامی ئەم پرسیارەیان بە پۆزەتیف داوەتەوە. بۆ نموونە, وەڵامی پۆزەتیفی هیگڵ بەم مەسەلەیە, خۆی بۆخۆی ڕۆشنە: ئەوەی لە جیهانی واقیعیدا





دەیزانین, ئەوە ڕێك ناوەڕۆکە فیکرییەکەیەتی, کە لە ژێر ڕۆشنایی ئەودا, جیهان پیادەکراوی بیرۆکەی ڕەهایە, کە هەر لە ئەزەلەوە, لە شوێنێك, سەربەخۆ لە جیهان و پێش جیهان, بوونی هەبووە. ئەوە شتێکی بەڵگەنەویستە کە فیکر ئەتوانێت دەربارەی ئەو ناوەڕۆکە زانیاری بەدەستبهێنێ کە خۆی پێشوەخت ناوەڕۆکی فیکرە. بە هەمان ئەندازەش ئەوە ڕۆشنە کە, ئەوەی پێویستە لێرەدا بیسەلمێنین ئەوەیە کە هەر لە سەرەتاوە بە تایبەت, بە شێوەیەکی نهێنی, هەبووە. بەڵام ئەمە بە هیچ جۆرێك, ڕێگە لە هیگڵ ناگرێت کە لە سەلماندنەکەی, دەربارەی جوتهاتنەوەی نێوان فیکر و بوون, بەم ئەنجامگیرییە بگات: بەو پێیەی کە بیرکرنەوەی ئەم, بڕیاری ڕاست و دروستیی فەلسەفەکەی ئەدات, مانای وایە کە فەلسەفەکەی ئەم, تاکە فەلسەفەی ڕاست و دروستە و پێویستە مرۆڤایەتی, بە حوکمی جوتهاتنەوەی فیکر و بوون, ئەم فەلسەفەیە بە پەلە لە مەیدانی تیۆرەوە بۆ مەیدانی جێبەجێکردن بگوازێتەوە و سەراسەرجیهان, بە گوێرەی پرانسیپەکانی هیگڵ, بگۆڕێت. ئەم ناڕۆشنییە تایبەتمەندیی هیگڵ و زۆربەی هەرەزۆری فەیلەسوفەکانی ترە.

بەڵام لە کەناری ئەمەدا, ژمارەیەکی تر لە فەیلەسوفەکان هەن کە, توانای ناسین, یان بەلای کەمەوە توانای ناسینی تەواوەتی جیهان, ڕەت ئەکەنەوە. لە نێو فەیلەسوفە هاوچەرخەکاندا, پێویستە قامك بخەینە سەر هیوم و کانت, کە بەم کۆمەڵەیەوە پەیوەستن و ڕۆڵی زۆر گەورەیان لە پەرەپێدانی فەلسەفەدا گێڕاوە. هیگڵ بۆ ڕەتکردنەوەی ئەم تێڕوانینە, تا ئەو جێگایەی کە دیدگای ئایدیالیستی ڕێگە ئەدات, قسەی بڕێنەرەوەی کردووە. ئەو شتەش کە فۆێرباخ لە ڕووی ماتریالیستییەوە بۆی زیادکردووە, زیاتر گاڵتەجاڕانەیە تا بگات بەوەی کە قووڵ بێت. بەڵام بڕێنەوەترین

ڕەتکردنەوە, بۆ ئەم فریوکارییە فەلسەفییە و گشت فریوکارییەکی تر, پراکتیك بە تایبەت تاقیکردنەوە و پیشەسازییە. هەر کاتێك توانیمان دروستیی تێگەیشتنمان بۆ دیاردەیەکی سروشتیی, بە سازکردنی ئەو دیاردەیە لە لایەن خۆمانەوە و بە هێنانەکایەوەی ئەو دیاردەیە لە دەروونی هەلومەرجەکانی خۆیەوە, سەرباری ئەمانەش بۆ مەبەستەکانی خۆمان بەکاری بهێنین, بسەلمێنین, ئەو کاتە ئیتر کۆتایی بەو تێگەییشتنەی کانت سەبارەت بە "شت لە خۆیدا", کە لە تواناادا نییە درك بکرێت, دێت. ئەو مادە کیمیاوییانەی کە پێکهاتەی تەنی ڕوەك و گیانەوەرانە, تا ئەو دەمەی کە کیمیای ئۆرگانیك یەك لە دوای یەکیانی ئامادەکرد, هەروەکوو "شت لە خۆیدا" مابووەوە, بەم کارە "شت لە خۆیدا" بە شت بۆ ئێمە گۆڕدرا, بۆ نموونە, ئێمە ئێستا ئالیزیرین کە مادەیەکی ڕەنگکردنە لە ڕووەکی ڕۆنیاسدایە[7] (الفوة), لە ڕەگی ڕۆنیاسەوە کە لە کێڵگەکاندا ئەچێنرێ, دەرناهێنین, بەڵکوو بە نرخێکی هەرزانتر و بە شێوەیەکی زۆر ساناتر, لە قەترانی خەڵوزی بەردینەوە دەری دەکێشین. سیستەمی خۆربی کۆپەرنیك, بۆ ماوەی سێسەد ساڵ هەر وەکوو گریمانەیەك مابۆوە, ئەگەری ڕاست و دروستییەکەی بە ڕادەیەکی زۆر بوو, بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە چوارچێوەی گریمانەیەك تێنەپەڕی بوو. بەڵام کاتێك کە لوڤیریی, بە پشتبەستن بە ژمارەگەلێك کە ئەم سیستەمە بەدەستی هێنابوو, نەك هەر سەلماندی کە هەسارەیەکی تر ئەبێ هەبێ, کە تا ئەو دەمە نە دۆزرابووەوە, بەڵکوو بە هۆی ژمێریارییەوە, ئەو جێگایەشی دەستنیشان کرد, کە ئەم هەسارەیە لە بۆشایی ئاسمان, داگیری کردووە, کاتێك کە گالە ئەم

[7] ...ینی گیایەکە بۆ ڕەنگی بەن بەکاردێت. (وەرگێڕی کوردی).



هەسارەیەی (١٠) بە فیعلی دۆزییەوە, ئیتر ئەو کاتە دروستیی سیستەمی کۆپەرنیك سەلمێندرا. ئەگەر کانتیستە نوێکان لە ئەڵمانیا لە هەوڵی زیندووکردنەوەی بیرەباوەڕەکانی کانتدان و ئاگنوستیکەکانیش لە ئینگلتەرا لە هەوڵی زیندووکردنەوەی بیروباوەڕەکانی هیومدان (بیروباوەڕێك کە هەرگیز لەو شوێنەدا نەمردووە), سەرباری ئەوەی کە دەمێکە لە باری تیۆر و پراتیکەوە ڕەتکراوەتەوە, پێویستە بووترێت کە ئەم کارە لە ڕوانگەیەکی زانستییەوە, هەنگاوێکە بەرەو پاش, دیسانەوە, لە ڕوانگەیەکی زانستییەوە, شێوەیەکی شەرمنۆکانەی قبووڵکردنی ماتریالیزمە بە نهێنی و خۆ بێبەریکرنە لێی بە ئاشکرا.

بەڵام لەو ماوە دوور و درێژەی کە لە دیکارتەوە تا هیگڵ, لە هۆبسەوە تا فۆێرباخ درێژەی هەیە, بە پێچەوانەی ئەوەی ئەوان وێنای ئەکەن, ئەوەی کە فەیلەسوفەکان بەرەوپێشیان برد, بە تەنها فیکری پەتی نەبوو. بەڵکوو بە پێچەوانەوە, لە ڕاستیدا ئەوەی ئەوان بەرەوپێشیان برد بە شێوەیەکی تایبەت, پێشخستنی سرووشتناسی و پیشەسازی, پێشخستنێکی بە جۆش و گورج, بوو, ئەم مەسەلەیە هەر لە سەرەتاوە لە لای ماتریالیستەکان, سەرنجڕاکێش بوو, بەڵام سیستەمی ئایدیالیستەکان کە ئەوانیش زیاتر وەك لە پێشوو, بە چەمکگەلی ئایدیالیستی ئاخنرابوو, لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە بە هۆی چەمکی پانتئیستی (یەکێتی بوون: وحدە الوجود/ و. کوردی)یەوە, ناکۆکی نێوان ڕۆح و مادە چارەسەر بکەن. سەرئەنجام لە سیستەمی هیگڵدا, کار بەوە گەییشت کە, ئەم سیستەمە چ لە ڕووی شێواز و چ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە ماتریالیستە, تەنها ئەوەیە کە لنگەوقوچ, بە شێوەی ئایدیالیستی ڕاوەستاوە.





پاش ئەم قسانە ئیتر ئەوە ڕۆشنە کە بۆچی شتارکە، کاتێك دێتە سەر باسی تایبەتمەندییەکانی فۆێرباخ، پێش هەر شتێك، لە هەڵوێستی فۆێرباخ لەم مەسەلە بنەڕەتییەدا، یانی مەسەلەی پەیوەندی فیکر و بوون، دەکۆڵێتەوە. لە دوای پێشەکییەکی کورت- کە تیایدا تیۆری فەیلەسوفەکانی پێشین، بە تایبەت لە کانتەوە، بە زبانێکی لە ڕادەبەدەری قورسی فەلسەفیی، خراپەڕوو، بە جۆرێك کە هیگڵ لەو دانراوەدا مافی خۆی پێ نەدراوە، چونکە شتارکە بە شێوەیەکی زۆر فۆرماڵی، خۆی بە هەندێك برگە لە دانراوەکانی هیگڵ ئەبەستێتەوە- ڕەوتی گەشەکردنی خودی "میتافیزیك"ی فۆێرباخ کە لە دانراوە یەك لە دوای یەکەکانی ئەم فەیلەسوفە سەبارەت بەم باسە ڕەنگئەداتەوە، خراوەتەڕوو. ئەم باسە بە وردی و زۆر بە ڕۆشنیی خراوەتەڕوو. بەڵام ئەوەی زیانی بەم باسە گەیاندووە، هەروەکوو زیانی بە سەرتاپای پەڕاوەکەی شتارکە گەیاندووە، ئەو هەموو دەستەواژە فەلسەفییانەیە، کە مەرج نەبوو بەکاربهێنرایە. ئەم هەموو دەستەواژانە کاتێك باسەکە قورستر ئەکات کە نووسەر خۆی بە بەکارهێنانی دەستەواژەی قوتابخانەیەکەوە نابەستێتەوە، وەیان بەلای کەمەوە، ئەو دەستەواژانەی کە هی خودی فۆێرباخن، بەڵکوو دەستەواژەی قوتابخانە جۆراوجۆرەکان، بە تایبەت ئەوانەی کە ئەمڕۆکە بە چەشنی پەتا، بە ناوی گرایشاتی فەلسەفییەوە بڵاو ئەبنەوە، تێکەڵ ئەکات و بەکاریان ئەهێنێ.

ڕەوتی پەرەسەندنی فۆێرباخ، ڕەوتی پەرەسەندنی کەسێکی هیگڵییە- ئەگەرچی فۆێرباخ هەرگیز، هیگڵییەکی ئەرتەدۆکس نەبووە- بەرەو ماتریالیزم. لە قۆناغێکی دیاریکراوی ئەم پەرەسەندنەدا، فۆێرباخ پەیوەندی خۆی بە تەواوی لەگەڵ سیستەمی ئایدیالیستی بەر لە خۆی ئەپچڕێنێ. سەرئەنجام بە هێزێکی لەشکاننەهاتووەوە، بەو درکە گەییشت





کە، "بیرۆکەی ڕەها" کە بەلای هیگڵەوە، پێش بوونی زەوی کەوتووە، "لەئارادابوونی چەمکە لۆژیکییەکان" بەر لە پەیدابوونی جیهان، جگە لە پاشماوەی خەیاڵی بڕوابوون بە خالقێکی ئەودیو سرووشتەوە، شتێکی دی نییە و جیهانی مادی کە ئێمە خۆشمان هەر سەر بەوین و بەهۆی هەستەکانەوە دەشێ درك بکرێت، تاکە جیهانی واقیعییە. هەرچی هەست و بیرکردنەوەی ئێمەیە، هەرچەندە وەك شتگەلێك کە لە سەرووی هەستەوە بێت دێنە پێش چاو، بەرهەمی ئۆرگانێکی مادیی جەستەیە، واتە، مێشك. مادە بەرهەمی ڕۆح نییە، بەڵکوو خودی ڕۆح، جگە لە باڵاترین بەرهەمی مادە، شتێکی تر نییە. بێگومان ئەمە ماتریالیستێکی پوختە. بەڵام کاتێك فۆێرباخ بەم خاڵە ئەگات، لە ناکاو وازئەهێنێ و ناتوانێت بەسەر ئەو خورافە فەلسەفییە باوە کە بە کرۆکی مەسەلەکەوە پەیوەست نییە، بەڵام پەیوەستە بە وشەی "ماتریالیزم"ەوە، زاڵبێت.

ئەو ئەڵێت: "بەلای منەوە ماتریالیزم بناغەی بینای ماهییەتی مرۆیی و زانستی مرۆییە، بەڵام بەلای منەوە ئەم ماتریالیزمە ئەو شتە نییە وەك بەلای فیزیۆلۆگ و سرووشتناسەکان، بە مانای بەرتەسکی وشەکە بێت، هەروەکوو بۆ مولیشوت بەو جۆرەیە، کە بە پێی ڕوانگە و پسپۆرییەك کە هەیانە، ناکرێت بەو جۆرە نەبێت، واتە بەلای منەوە ماتریالیزم، خودی بیناکە نییە. کاتێك کە بەرەو دوا ئەگەڕێینەوە، من بە تەواویی لەگەڵ ماتریالیستەکانم، کاتێك کە بەرەو پێشەوە ئەڕۆین، لەگەڵیاندا نیم.

فۆێرباخ لێرەدا، ماتریالیزم وەکوو جیهانبینییەکی گشتی کە لەسەر بنچینەی تێگەیشتنێکی دیاریکراو لە پەیوەندی نێوان مادە و ڕۆح بنیاتنراوە، لەگەڵ ئەو شێوە تایبەتییەی کە ئەم جیهانبینییە لە قۆناغێکی دیاریکراوی مێژوویی، یانی لە سەدەی هەژدەیەم بە خۆیەوە گرتبووی،

تێکەڵ ئەکات. سەرباری ئەوەش فۆێرباخ, لە نێوان ئەم ماتریالیزمە و ئەو شێوە سواوە عامییانەیەی کە ماتریالیزمی سەدەی هەژدەیەم ئەمڕۆ بەو جۆرەی لە مێشکی سروشتناس و پزیشکەکان درێژەی هەیە, کە لە پەنجاکاندا موژدەبەخشە (مبشر) گەڕیدەکان, بوخنەر و فوگت و مۆلیشوت بانگەشەیان بۆ ئەکرد, تێکەڵ ئەکات. بەڵام ماتریالیزمیش هەروەك ئایدیالیزم, چەندین قۆناغی پەرەسەندنی بە خۆوە بینیوە. ماتریالیزم لەگەڵ هەر دۆزینەوەیەکدا کە سەردەمێکی نوێ ئەهێنێتە کایەوە, تەنانەت با ئەو دۆزینەوەیە لە بواری مێژووی سروشتناسیشەوە بێت, پێویستە بە ناچاری, شێوەی خۆی بگۆڕێت. هەروەها لەو کاتەوەی کە مێژوو بە شێوەیەکی ماتریالیستانە شی ئەکرێتەوە, دەرگای نوێ بۆ پەرەسەندنی ماتریالیزم ئاوەڵا بووە.

ماتریالیزمی سەدەی ڕابردوو (١١), زۆرتر ماتریالیزمێکی میکانیکی بوو, چونکە لە نێو گشت زانستە سروشتییەکانی ئەو ڕۆژگارەدا, تەنها میکانیك و بە تایبەت میکانیکی تەنە ڕەقەکان (زەمینی و ئاسمانی), یان بە دەربڕینێکی کورت, میکانیکی کێشکردن بوو بە تەنها کە, بە کامڵییەکی دیاریکراو گەیشتبوو. کیمیا هێشتا لە قۆناغی ساواییدا بوو و تیۆری فلۆژیستۆن (١٢) بەسەریدا زاڵ بوو. بایۆلۆژی هێشتا لە بێشکەدا بوو, لێکۆڵینەوەی ئۆرگانیزمی ڕوەکی و ئاژەڵی بە شێوەیەکی سەرەتایی بوو و بە هۆکاری میکانیکی ڕووت, لێکئەدرایەوە. لە دیدی ماتریالیستەکانی سەدەی هەژدەیەمەوە, مرۆڤ بریتی بوو لەو جۆرە دەزگایەی کە ئاژەڵ لە دیدی دیکارتەوە هەی بوو. بەکاربردنی بنەماکانی میکانیك بەم شێوە تاك و ڕەهایە بۆ ئەو پرۆسانەی کە سروشتێکی کیمیاوی و ئۆرگانیکییان هەیە_ بە جۆرێك کە هێشتا یاساکانی میکانیك





کاری خۆی ئەکات, بەڵام لە لایەن یاساگەلێکی تری بەرزترەوە, خراوەتە ڕیزی دواوە_ یەکەمین تەسکبینیی خودی تایبەتمەندیەکانی ماتریالیزمی کلاسیکی فەرەنسی پێکئەهێنێ, کە لەو ڕۆژگارەدا شتێکی ناچاریی بوو.

دووەمین تەسکبینیی تایبەتمەندی ئەم ماتریالیزمە, بریتییە لە بێتوانایی ئەم ماتریالیزمە لە درککردنی جیهان بە وێنەی پرۆسەیەك و بە وێنەی ئاوەها مادەیەك کە لە حاڵی پەرەسەندنی مێژوویی بەردەوامدایە. ئەمەش لەگەڵ هەلومەرجی سروشتناسی و ڕێبازی بیرکردنەوەی فەلسەفیی میتافیزیکی واتە, دژی دیالێکتیك, لەو ڕۆژگارەدا, کە بەو هەلومەرجەوە پەیوەست بوو, جووتدێتەوە. سروشت لە بزووتنەوەیەکی هەمیشەییدایە: ئەم بابەتەش لەو سەردەمە ئەزانرا. بەڵام ئەم بزووتنەوەیە بە پێی تێگەییشتنی باوی ئەو دەمە, هەمیشە لە بازنەیەکدا دەخولێتەوە, بەم جۆرە لە بنەڕەتدا, لە هەمان شوێن دەمێنێتەوە, واتە: هەمیشە بە هەمان ئەنجامگیری ئەگاتەوە. لەو ڕۆژگارەدا, ئەم تێگەیشتنە شتێکی ناچاریی بوو. تیۆری کانت دەربارەی پەیدابوونی کۆمەڵەی خۆر تازە هاتبووەکایەوە و هێشتا هەروەك قسەیەکی خۆش سەیر دەکرا. هەرچی مێژووی پەرەسەندنی زەوی, واتە زەویناسی بوو, هێشتا بە هیچ جۆرێك نە ئەزانرا. لەو کاتەدا, زانست بە شێوەیەکی گشتی, لە توانایدا نەبوو کە بیرۆکەی پەیدابوونی بوونەوەرە زیندووەکانی ئێستا لە ڕێگەی گەشەکردنێکی دوور و درێژ, لە سادەوە بۆ ئاڵۆز, بە شێوەیەکی زانستی بسەلمێنێ. لەبەر ئەوە تیۆری نامێژوویی دەربارەی سروشت, وەك شتێکی ناچاری بوو. لەم ڕووەوە, ناکرێت ئەم کەموکوڕییە بخرێتە ئەستۆی فەیلەسوفەکانی سەدەی هەژدەیەم, تەنانەت بە خودی هیگڵیشەوە. بەلای هیگڵەوە سروشت, کە "بەخۆنامۆبوون"ێکی سادەی فیکرە, ناتوانێت لە کاتدا پەرەبسێنێ, ئەتوانێت شێوە

جۆربەجۆرەکانی خۆی تەنها لە شوێندا فراوان بکاتەوە, بەم شێوەیە دەرئەکەوێ کە, سروشت ناچارە هەمان بزووتنەوەی پەرەسەندن, تەواوی ئەو قۆناغانەی پەرەسەندن کە لە خۆی گرتووە, لە هەمان کاتدا و یەك لە تەنیشتی یەك, دووبارە بکاتەوە. هیگڵ ئەو خورافەیەی کە دەڵێت, پەرەسەندن لە شوێن و لە دەرەوەی کات_کە کات مەرجی بنەڕەتییە بۆ پەرەسەندن__ لە وەختێکدا بەسەر سروشتدا سەپاندی کە, زەمینناسی و کۆرپەلەناسی و فیزیۆلۆژی ڕوەك و گیانەوەر و کیمیای ئۆرگانیك گەییشتبوونە ئاستێکی باش, لە وەختێکدا کە لە سەر بنچینەی ئەم زانستە نوێیانە, لە گشت جێگایەك, گریمانەی بلیمەتانە بەر لە تیۆری پەرەسەندن کە دواتر هاتەکایەوە, پەیدابوون ( بۆ نموونە هەروەکوو لەلای گۆتە و لامارك). بەڵام سیستەمەکە بەم جۆرە حوکمی ئەکرد, میتۆدەکەش بۆ ڕازیکردنی سیستەمەکە, ئەبوو ناپاکی لە خۆی بکات.

لە بواری مێژووشدا بە هەمان شێوە, تێگەییشتی مێژوویی بۆ شتەکان لە ئارادا نەبوو. لێرەدا خەبات لە دژی پاشماوەکانی سەدەکانی ناوەڕاست سەرنجڕاکێشە. سەدەکانی ناوەڕاست بە وێنەی وەستانێکی سادە لە ڕەوتی مێژوو دەژمێرن, کە هۆکارەکەی ئەو بەربەرییەتە گشتییە بوو کە هەزار ساڵی خایاند. هیچ کەسێك سەرنجی ئەو سەرکەوتنە مەزنانەی کە لە ماوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا بەدەستهات, لە فراوانبوونەوەی داوێنی فەرهەنگی لە ئەورووپا, لە میللەتانی گەورە کە توانای زیندەگییان هەبوو, کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا, یەك لە تەنیشتی یەکتر پەیدابوون و سەرئەنجام لەو سەرکەوتنە تەکنیکییە گەورانەی سەدەکانی چواردەیەم و پانزەیەم, نەدا. بەو شێوەیە, لە ئارادابوونی تێگەشتنێکی دروست لە پەیوەندییە مێژووییە



گەورەکان ئەستەم بوو, لە باشترین حاڵەتیشدا مێژوو, جگە لە کۆمەڵێك نموونە و وێنە, کە لە خزمەتی فەیلەسوفەکاندا بێت, شتێکی تر نەبوو.

کۆششکارانێك کە لە ساڵانی پەنجاکان لە ئەڵمانیا ڕۆڵی بڵاوکردنەوەی ماتریالیزمیان لە ئەستۆ گرتبوو, لە هیچ بارێکەوە لە سنووری وانەی مامۆستاکانیان تێ نە ئەپەڕین. سەرکەوتنە تازە بە تازەکانی سرووشتناسیش سوودێکی بۆیان نەبوو, مەگەر وەکوو بەڵگەگەلێکی تازە لە دژی هەبوونی خولقێنەری گەردوون بەکاری بهێنن. ئەوانە تەنانەت لە بیری ئەوەشدا نەبوونە کە پەرەی زیاتر بە تیۆری بدەن. ئایدیالیزم کە لەو دەمەدا کارامەییەکەی وشکی کردبوو و لە لایەن شۆڕشی ١٨٤٨ەوە تووشی برینێکی کوشندە ببوو, بەوەی کە لەو دەمەدا, ماتریالیزمیشی ئەبینی کە دوچاری داکەوتنێکی زۆر هاتووە, دڵخۆش ئەبوو. فۆیرباخ بە تەواوەتی لەسەر حەق بوو, کاتێك کە خۆی لە هەر جۆرە ماتریالیستێکی لەم چەشنە بێبەری ئەکرد, بەڵام ئەو, ئەو مافەی نەبوو کە, وانەی گەڕیدە موژدەبەخشەکان و ماتریالیزم بە مانا گشتییەکەی, تێکەڵ بە یەکتری بکات.

لەگەڵ ئەوەدا, پێویستە کە دوو حاڵەت لەبەرچاو بگرین. یەکەم, سرووشتناسی لە سەردەمی فۆیرباخدا, بە پرۆسەیەکی سەختی هەڵهاتن (اختمار)دا تێ ئەپەڕی, کە تەنها لەم پانزەساڵەی دواییدا, بە سەرئەنجامی ڕۆشنی ڕێژەیی پەرەسەندنی خۆی گەییشت. لەو کاتەدا بابەتگەلێکی تازە لە زانست, بە قەوارەیەکی وەها کە پێشتر نەبینرابوو, کەڵەکە ببوو, بەڵام لە توانادا نەبوو کە پەیوەندی و پاشان نەزمێك لە نێو پەشێویی ئەو دۆزینەوانە, کە بە خێراییەکی زۆر یەك لەسەر یەکتر کەڵەکە ئەبوون, بدۆزرێتەوە, مەگەر بەم دواییە نەبێت. ئەوە ڕاستە کە فۆیرباخ هاودەمی سێ





دۆزینەوەی زۆر گرنگ بوو کە بریتی بوون لە, دۆزینەوەی خانە, تیۆری گۆڕانی وزە, تیۆری پەرەسەندن کە بە ناوی داروینەوە ناونرا. بەڵام فەیلەسوفێك کە گۆشەگیرانە لە گوندێك ژیان بەسەربەرێت, لە کوێ بۆی دەکرێت کە بە ئەندازەی پێویست بە دوای پێشڕەوییەکانی زانست بکەوێت, تاوەکوو بتوانێت بە ڕادەی پێویست پەی بە بەهای ئەو دۆزینەوانە ببات, کە لە کاتێکدا خودی زانایانی زانستەکانی سرووشت لەو سەردەمەدا, گومانیان لەوانە هەبوو, یان چۆنیەتی بەکارهێنانیان نەدەزانی؟ گوناهێك کە لێرەدایە, بۆ هەلومەرجی شەرمهێنەری ئەڵمانیا ئەگەڕێتەوە, کە لە سایەیدا بە تەنها, کەسانێکی هیچوپوچی بێمایەی چینەکەر و خۆهەڵکێش, کورسییەکانی خوێندنی فەلسەفەیان داگیرکردووە, لە کاتێکدا فۆێرباخ لە ڕادەبەدەر لەو هیچوپوچە بێمایانە لە پێشتربوو, ئەبوو بە ناچاری ژیانێکی جوتیارانە لە سوچی کوێرە دێیەکدا, بە دابڕاوی بەرێتەسەر. کەواتە فۆێرباخ لەوەدا گوناهێکی نەبووە, لە کاتێکدا ئەبینین کە تێگەییشتنی مێژوویی بۆ سروشت کە تازەبەتازە فەراهەمە و هەموو ئەو بەشە تەسك و یەکلایەنانەی کە لە ماتریالیزمی فەرەنسیدا هەبوو لەناوبردووە, ئەو دەستی پێ ڕا نە ئەگەییشت.

دووەم, فۆێرباخ بە تەواوی لەسەرحەق بوو کاتێك کە گوتی ماتریالیزمی زانستی سروشتی بە تەنها ((بنچینەی بینای زانستی مرۆڤایەتی پێکئەهێنێ , بەڵام هێشتا خودی بیناکە نییە)), چونکە ئێمە نەك هەر لە سروشت, بەڵکوو لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیشدا ژیان بەسەرئەبەین, کە مێژووی پەرەسەندن و زانیاری ئەو لە هی سروشت کەمتر نییە. کەواتە ئەرکێك کە دەبێ ئەنجام بدرێت, گونجاندنی زانستی کۆمەڵە, یانی تێکڕای ئەو زانستانەی بە زانستی مێژوویی و فەلسەفی ناودەبرێن, لەگەڵ بنچینەی





ماتریالیزم و دووبارە بیناکردنەوەی لەسەر ئەو بنچینەیە. بەڵام جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە لە چارەی فۆێرباخ نە نوسرابوو. ئەو لێرەدا سەرباری "پایە" ماتریالیستییەکەی, هێشتا لە کۆتوبەندی ئایدیالیستی کۆن ڕزگاری نەبووە, ئەمەش بۆخۆی دانی پێدا ناوە لەو کاتەیدا کە ئەڵێت: "کاتێك کە بەرەو ڕابردوو ئەگەڕێمەوە, من بە تەواوەتی لەگەڵ ماتریالیستەکانم, کاتێك بەرەو پێش ئەڕۆم لەگەڵیاندا نیم". هەروها لێرەدا, یانی لە بواری کۆمەڵایەتیدا, فۆێرباخ خۆی "بەرەوپێش نەبردووە" و تێڕوانینی ساڵی ١٨٤٠ یان ١٨٤٤ی خۆی تێنەپەڕاندووە, ئەمەش دیسانەوە بە دیاریکراوی, بە حوکمی گۆشەنشینی خۆی, کە بەهۆی خەسڵەتێکەوە کە هەی بووە, لە هەر فەیلەسوفێکی تر زیاتر پێویستی بە تێکەڵبوونی کۆمەڵگا هەبوو, ناچاربووە بیروباوەڕەکانی خۆی نەك لە چاوپێکەوتنی دۆستانە وەیان دوژمنانە لەگەڵ کەسانێکی هاوئاستی خۆی, بەڵکوو لە تەنهاییدا دابنێت. دواتر بە شێوەیەکی درێژتر, ئەچینە سەر باسی ئەوەی کە فۆێرباخ, تا چ ئاستێکی بەرز لەم بوارەی کە باسمان کرد, ئایدیالیستانە ماوەتەوە.

ئەو خاڵەش باس بکەین کە شتارکە, ئایدیالیستیی فۆێرباخ, لەو شتەی کە بە واقیعی هەیە نابینێت. "فۆێرباخ ئایدیالیستە, بڕوای بە پەرەسەندنی مرۆڤایەتی هەیە" (ل١٩). "لەگەڵ ئەوەدا, ئایدیالیزم وەك پایە و بناغەی هەموو شتێك دەمێنێتەوە. ڕیالیزم تەنها ئەو دەمەی کە بە دووی نیازە ئایدیالیستەکانماندا ئەکەوین, لە گومڕایی دەمان پارێزێ. مەگەر بەزەیی, خۆشەویستیی, خزمەتکردنی ڕاستیی و ڕەوایی, هێزگەلی ئایدیالیستی نین؟" (ل٨).

یەکەم، ئایدیالیزم لێرەدا هیچ مانایەکی نییە جگە لە هەوڵدان لە پێناوی ئامانجە ئایدیاڵەکاندا نەبێت. بەڵام ئەم ئامانجانە بە ناچاری، ئەوپەڕەکەی بە تەنها، بە ئایدیالیزمی کانت و "ئیمپراتیف کاتەگۆریك" (حوکمی یەلاکەرەوە_بەپێی دەقە عەرەبییەکە_ و. کوردی)ەکەیەوە پەیوەستە. بەڵام تەنانەت کانت بۆخۆی، ناوی فەلسەفەکەی کە ناوە "ئایدیالیزمی ترانساندانتال" (ئایدیالیزمی پێش تاقیکردنەوە_ بەپێی دەقە عەرەبییەکە_ و. کوردی)، لەبەر ئەوە نییە کە لە ناوەڕۆکدا باسی ئایدیاڵە ئەخلاقییەکان ئەکات، بەڵکوو ئەم مەسەلەیە هۆکاری تری هەیە، کە لای شتارکە ڕۆشنە. ئەو خورافەیەی کە ئەڵێت کرۆکی ئایدیالیزمی فەلسەفیی بریتییە، لە بڕوابوون بە ئایدیاڵی ئەخلاقی، یانی کۆمەڵایەتی، لە دەرەوەی فەلسەفە و لەلای هیچوپوچە تەسکبیرە ئەڵمانییەکان، ئەوانەی کە چینەی وردە خۆراکی زانستی فەلسەفیی پێویستی خۆیان لە شیعرەکانی شیلەرەوە ئەکەن. هیچ کەسێك بە ڕادەی هیگڵ ڕەخنەی توند لە "ئیمپراتیف کاتەگۆریك"ی بێتوانای کانت ناگرێت (بێتوانا لەو بارەوە کە خوازیاری مەحاڵە و لەبەر ئەوە هەرگیز بە ئەنجامێکی واقیعی ناگات)، هەروەها هیچ کەس توندتر لەو شێوەیەی هیگڵ، گاڵتەی بەو گرایشە هیچوپوچ و تەسکبیرانەیە بۆ ئەو خەونانەی کە دەربارەی ئایدیاڵگەلێك بوون کە جێبەجێ نە ئەبوون و لە لایەن شیلەرەوە بڵاوئەکرانەوە، نە ئەکرد (بڕوانە، بۆ نموونە، پەرتووکی "فینۆمینۆلۆژیا" یانی، "زانستی دیاردە ناوازەکان"). لەگەڵ ئەوەشدا هیگڵ بە تەواوەتی ئایدیالیست بوو.

دووەم، بە هیچ جۆرێك ناکرێت لەو واقیعە لابدەیت کە هەموو ئەو شتانەی پاڵ بە مرۆڤەوە ئەنێن بۆ بەئەنجامگەیاندنی چالاکییەك، پێویستە بە مێشکیدا تێ بپەڕێت، تەنانەت مرۆڤ خواردن و خواردنەوەشی بە





کاریگەریی هەستکردن بە برسێتی و تینوێتی کە لە مێشکیدا ڕەنگئەداتەوە دەستپێئەکات، ئەو کاتەش کە هەستی تێربوون لە مێشکیدا ڕەنگی دایەوە، دەست لە خواردن هەڵئەگرێت. کاریگەرییەکانی جیهانی دەرەوە لەسەر مرۆڤ لە مێشکدا ئەنەخشێ و بە شێوەی هەستەکان، بیرۆکەکان، پاڵنەرەکان، ئارەزووەکان، وەیان بە کورتییەکەی، بە شێوەی "مەیلە ئایدیاڵەکان" ڕەنگئەدەنەوە و بەم شێوەیەش ئەو مەیلانەی کە باسمان کردن، بۆ "هێزە ئایدیاڵەکان" ئەگۆڕێن. ئەگەر کەسێك تەنها بەوەی کە "مەیلە ئایدیاڵەکان"ی هەیە و بڕوای بە کاریگەریی "هێزە ئایدیاڵەکان" بەسەر خۆیەوە هەیە، ئیتر ببێتە کەسێکی ئایدیالیست، ئەوا هەر کەسێك کە بە ڕادەیەکی ئاسایی کەموزۆر گەشەی کردبێت، بە تەبیعەتی خۆی ئایدیالیستە و ئەوەی کە لەم نێوانەدا ئەمێنێتەوە و ناڕۆشنە ئەوەیە، چۆن ئیتر ئەکرێ لە دنیادا ماتریالیستەکان هەبن؟

سێیەم، بڕوابوون بەوەی کە مرۆڤایەتیی_ لانیکەم لە ئێستادا_ بە شێوەیەکی گشتی بەرەو پێشەوە ئەڕوات، بە هیچ جۆرێك پەیوەست نابێتەوە بەو ناکۆکییەی کە لە نێوان ماتریالیزم و ئایدیالیزمدا هەیە. ماتریالیستە فەرەنسییەکان تا ڕادەیەك دەمارگیرانە بەم بڕوایەوە پەیوەستبوون_ لانیکەم لە ڤۆڵتێر و ڕۆسۆوە کە بڕوایان بە بوونی خودا وەك ئافرێنەری جیهان هەبوو_ و زۆرجار گەورەترین قوربانی شەخسییان لە پێناودا داوە. ئەگەر کەسێك تەواوی ژیندەگی خۆی لە پێناوی "ڕاستی و ڕەوایی" بە مانای باشی ئەم وشانە، تەرخانکردبێت، ئەوا بۆ نموونە، ئەو کەسە دیدرۆ بووە. کاتێك کە شتارکە تەواوی ئەمانە بە ئایدیالیزم ناوزەد ئەکات، جگە لە پیشاندانی ئەوەی کە بەلای ئەوەوە، وشەی "ماتریالیزم" و لە پاڵیشیدا

تێکڕای ئەو ناکۆکییانەی کە لە نێوانی ئەم دوو ئاراستەیەدا هەیە, هەرجۆرە مانایەکی لە دەستداوە, شتێکی دیکە نییە.

شتارکە ئالێرەدا بە کردەوە لە بەرامبەر خورافەیەك کە لە دژی ناوی ماتریالیزم لەلایەن هیچوپوچە بیرتەسکەکانەوە ئەکرێت پاشەکشە ئەکات, پاشەکشەیەك کە لێخۆشبوونی تیادا نییە, ئەگەرچی ئەشێ کە بێئاگایانە بووبێت, ڕیشەی خورافەیەك کە لەلای ئەو هیچوپوچە بیرتەسکانەیە, ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو تۆمەتە کۆنانەی کە لە لایەن کەشیشەکانەوە بۆ ماتریالیزم هەڵئەبەسترا. کەسێکی هیچوپوچی بیرتەسك پێی وایە کە ماتریالیزم یانی زۆرخۆریی, بەدمەستیی, شەهوەت, ئارەزووەجەستەییەکان, لەخۆباییبوون, پارەپەرستی, پیسکەیی, تەماح, قازانجپەرستیی, سەوداگەریی (مضاربة) لە بۆرسەدا و بە کورتییەکەی هەموو کارێکی چەپەڵ کە ئەو بۆخۆی بە دزییەوە ئەی کات. هەروەها بەلای ئەوەوە ئایدیالیزم یانی بڕوابوون بە چاکە و بەخشندەیی, خۆشویستنی گشت مرۆڤایەتی و بە شێوەیەکی گشتی بڕوابوون بە "جیهانێکی باشتر" کە لەلای کەسانی تر بانگەشەی بۆ دەکات,  بەڵام بۆخۆی تەنها ئەو دەمە بڕوای پێی هەیە کە تووشی مایەپوچی یان سەرئێشەی پاش مەستبوون هاتبێت, بە کورتییەکەی سەردەمێك کە پێویستە ئەو قۆناغە نەویستراوە تێپەڕێنێ کە بەرئەنجامی زیادەڕەویی "ماتریالیستی" ئاسایی خۆیەتی. لەو کاتەدا گۆرانییە پەسەندکراوەکەی خۆی ئەڵێتەوە: مرۆڤ چییە؟ نیوە گیانەوەر, نیوە فریشتە.

ئەو شتانەی لێ دەرچێت, لە باقی شتەکانی تردا شتارکە, لە بەرامبەر هێرش و تیۆری ئەو مامۆستایانەی کە ئەمڕۆکە لە ئەڵمانیا بە ناوی



فەیلەسوفەوە هاتوهاواریانە, سەرسەختانە لە هەوڵی داکۆکیکردن بووە لە فۆێرباخ. بێگومان ئەمە بەلای کەسانێکەوە کە بایەخ بەو نەوەیە ئەدەن کە لە فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی ماونەتەوە, مەسەلەیەکی گرنگە, ئەمە بۆ خودی شتارکەش وەك مەسەلەیەکی پێویست دەهاتە پێشچاو. بەڵام ئێمە خوێنەر دەبەخشین.

## بەشی سێیەم: فۆێرباخ

ئایدیالیزمی واقیعیی فۆێرباخ ئەو کاتە بە خێرایی دەرئەکەوێت, کە لە فەلسەفەکەیدا, بچینە سەر مەسەلەی ڕەوشت و ئایین. فۆێرباخ بە هیچ جۆرێك گەرەکی نییە کە ئایین هەڵوەشێنێتەوە, بەڵکوو مەبەستی ئەو کامڵکردنی بوو. خودی فەلسەفە ئەبێ لە ئاییندا بتوێتەوە.

"قۆناغەکانی مرۆڤایەتی تەنها بە ئاڵوگۆڕە ئایینییەکان لە یەکدی جودا ئەکرێنەوە, بزووتنەوەی مێژوویی تەنها ئەو دەمە بە بناغەیەکی قوڵ ئەگات, کە بە قووڵی ڕۆچووبێتە نێو دڵی مرۆڤەوە. دڵیش فۆرمی ئایین نییە, لەبەر ئەوە ناشێت کە بووترێت, پێویستە ئایین دیسانەوە لە دڵدا جێگیر بێت, دڵ جەوهەری ئایینە" (لە پەڕاوی شتارکەوە وەرگیراوە, ل. ١٦٨).

بەپێی تیۆری فۆێرباخ, ئایین پەیوەندی هاودڵیی نێوان مرۆڤێ لەگەڵ مرۆڤێکی ترە و لەسەر بنەمای سۆز دامەزراوە, پەیوەندییەك کە هەتاوەکوو ئێستا بەدوای حەقیقەتی خۆیدا, لە ڕەنگدانەوەی خەیاڵیی بۆ واقیع_بە هۆی خودایەك یان چەند خودایەکەوە, کە هەموو ڕەنگدانەوە خەیاڵییەکان, لە سروشتی مرۆییدا هەن _دەگەڕێ, ئێستاکەش ڕاستەوخۆ و بە بێ هیچ ناوەندێك, لە خۆشەویستی نێوان "من" و "تۆ" دا دەی بینێتەوە. بەو جۆرە سەرئەنجام مەسەلەکە بەلای فۆێرباخەوە بەوە دەگات کە, خۆشەویستی سێکسی یەکێکە لە بەرزترین, وەیان بەرزترین شێوەیە بۆ پەیڕەویکردن لە ئایینە نوێکەی.





پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤ کە لەسەر خۆشەویستی دامەزراوە, بە تایبەت پەیوەندی نێوان تاکەکانی دوو جنسی مرۆڤ, هەر لە سەرەتای پەیدابوونی مرۆڤەوە لە ئارادابووە. بەڵام سەبارەت بە خۆشەویستی سێکسی بە شێوەیەکی تایبەت, پێویستە بڵێین کە ئەم خۆشەویستییە لە ماوەی هەشتسەد ساڵی دواییدا گرنگی خۆی پەیداکرد و ڕێوشوێنێکی بۆخۆی داگیرکرد بەجۆرێك کە بووە تەوەرەیەکی پێوستی وا کە هەرچی هونەر هەیە, بە دەوریدا بچەرخێن. ئایینە جێکەوتەکانی کە هەن تەنها لەو چوارچێوەیەدا خۆ قەتیس ئەکەن کە, لە ڕادەبەدەر ڕێکخستنی خۆشەویستی سێکسی لە لایەن دەوڵەتەوە, یانی یاساکانی پەیوەست بە ژن و شوویی پیرۆز ئەکەن, ئەو ئایینانەی کە ڕەنگە سبەی ڕۆژ بە تەواوەتی لە نێوبچن, بە بێ ئەوەی لە پراکتیکدا کەمترین ئاڵوگۆڕێك بەسەر خۆشەویستی و دۆستایەتیدا بێت. ئایینی مەسیحی لە فەرەنسا لە ساڵەکانی ١٧٩٣_ ١٧٩٨ بە جۆرێك نەما کە, خودی ناپلیۆن نەیتوانی هەروا بە ئاسانی و بە بێ بەرگری بیگێڕێتەوە. بەڵام بە درێژایی ئەو ماوەیە هەست بە پێویستی شتێك لە جۆری ئایینە نوێکەی فۆێرباخ نە ئەکرا, تاوەکوو جێگەی ئەو بگرێتەوە.

ئایدیالیستی فۆێرباخ لێرە لەوەدایە کە ئەو, خۆشەویستی سێکسی, دۆستایەتی, بەزەیی, خۆنەویستی و شتی تری لەم بابەتانە, یانی تێکڕای پەیوەندییە مرۆییەکان کە لەسەر بنچینەی ئارەزووی هەردوولا دامەزراوە, وەك شتێك لە خۆیدا, یانی بە بێ پەیوەستکردنی ئەوانە بە سیستەمێکی ئایینی تایبەت, کە بەلای ئەوەوە بە ڕابردووەوە پەیوەستە, لێکناداتەوە. بەڵام ئەو بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەم پەیوەندییانە تەنها ئەو دەمە مانای تەواوی خۆیان دەبەخشن کە بە دەستەواژەی "ئایین" پیرۆز بکرێن. مەسەلەی سەرەکی بەلای ئەوەوە, لەسەر لە ئارادابوونی ئەم پەیوەندییە مرۆڤایەتییە

پەتییە نییە، بەڵکوو مەسەلە لەسەر تێڕوانینی خەڵکە بۆ ئەم پەیوەندییە بە وێنەی ئایینێکی نوێ و ڕاستەقینە. ئەو تەنها ئەو کاتە ئامادەیە دان بە کامڵی ئەوانەدا بنێت، کە بە مۆری ئایین مۆر کرابن. وشەی religion(ئایین) لە کرداری religare[8] ەوە هاتووە و لە سەرەتادا بە مانای پەیوەندی بووە. لەبەر ئەوە هەر جۆرە پەیوەندییەکی دولایەنەی نێوان دوو کەس، ئایینە. ئەم جۆرە یاریکردنە بە ڕەگوڕیشەی وشە، دوا کەلێن بوو، کە فەلسەفەی ئایدیالیستی خۆی لێیەوە قوتار بکات. بۆ وشەکان ئەو واتایە دانابڕن کە لە میانەی پەرەسەندنی مێژووییەوە بە خۆیانەوە گرتوویانە، بەڵکوو ئەگەڕێنەوە بۆ ڕیشەی زمانەوانیی وشەکان. بۆئەوەی وشەی ئایین کە لە بیرەوەرییەکانی ئایدیالیزمدا خۆشەویستە نەپوکێتەوە، خۆشەویستی سێکسی و پەیوەندی سێکسی تا ئاستی "ئایین" بڵند ئەکەنەوە. لە ساڵانی چلەکاندا، ڕیفۆرمیستە پاریسییەکان کە سەر بە ڕێبازی لوئی بلان بوون و لە ڕوانگەی ئەوانەوە مرۆڤ بە بێ ئایین مانەندی دڕندەیەکی کێوییە و بە ئێمە ئەڵێن: " Donc, l`athéisme c`est votr religion!"[9] ڕێك بەو جۆرە داوەری ئەکەن. کاتێك فۆیرباخ لە هەوڵی بنیاتنانی ئایینی ڕاستەقینە لەسەر بنەمای خەسڵەتی ماتریالیستی سروشتدا بوو، بەو کەسەی دەکرد کە پێی وابوو، کیمیای هاوچەرخ، کیمیاگەریی ڕاستەقینەیە. ئەگەر بشێت کە ئایین دەستبەرداری خودا بێت، ئەوا کیمیاگەریش ئەتوانێت دەستبەرداری بەردی فەلسەفی بێت. سەرباری ئەوە، پەیوەندییەکی زۆر نزیك لە نێوانی کیمیاگەریی و ئاییندا

[8] پەیوەندیکردن. (و. عەرەبی).

[9] کەواتە، ئایینی ئێوە ئاتەئیستییە! (و. عەرەبی).





هەیە. بەردی فەلسەفی زۆر تایبەتمەندی تێدایە، کە بە تایبەتمەندیی خوداوەند دەچێت، کیمیاگەرانی میسری و یۆنانیش، لە دوو سەدەی یەکەمی زایینیدا، بەپێی ئەو زانیارییانەی کە بیرتلو و کوپ بە ئێمەیان داوە، دەستیان هەبووە لە دانانی ئایینی مەسیحیدا.

جەختکردنەوەی فۆیرباخ لەسەر ئەوەی کە "قۆناغەکانی مرۆڤایەتیی تەنها بە ئاڵوگۆڕە ئایینییەکان لە یەکتری جودا دەکرێنەوە"، بە تەواویی نادروستە. وەرچەرخانی مێژوویی گەورە، بە بێ ئەوەی هاوکات ئاڵوگۆڕێك لە ئاییندا هاتبێتە کایەوە، ڕوویداوە، ئەوەی تا ڕادەیەك لەم ڕووەوە لەبەرچاوبگیرێ، تەنها سێ ئایینی جیهانی یانی بودایی و مەسیحی و ئیسلامە، کە هاوشانی ئەوانە هەندێك ئاڵوگۆڕ پێکهاتووە. ئایینە کۆنەکان کە لە نێو هۆز و میللەتەکان بە شێوەیەکی خۆبەخۆ پەیدابوونە، خەسڵەتی پڕوپاگەندەیی نەبووە و هەر کاتێك هۆزەکان یان خەڵکیی سەربەخۆیی خۆیان لەدەستدابێت، ئەوا ئایینیش تەواوی هێزی بەرگری خۆی لەدەسئەدات. لە لای ئەڵمانەکان بۆ بە ئەنجامگەیشتنی ئەم کارە، بەریەککەوتنێکی کەم لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی جیهانیی ڕۆم کە لە حاڵی هەڵوەشانەوەدا بوو وە لەگەڵ ئایینی مەسیحی جیهانی کە لەو دەمەدا ڕۆمەکان تازە چووبوونە سەری و وەڵامدەرەوەی هەلومەرجی ئابوری و سیاسی و ڕۆحییان بوو، بەس بوو. تەنها لە پەیوەند بەم ئایینە جیهانییانەوە کە کەموزۆر بە شێوەیەکی دەسکرد پەیدابوون، بە تایبەت مەسیحی و ئیسلام، ئەکرێ بگوترێت کە، بزووتنەوە گشتییە مێژووییەکان ڕەنگی ئایینیان بە خۆوە گرتبوو. بەڵام تەنانەت لە بواری بڵاوبوونەوەی مەسیحیەتیشدا، ئەو شۆڕشانەی کە بە ڕاستی گرنگییەکی گشتییان هەبوو، تەنها لە قۆناغە سەرەتاییەکانی تێکۆشانی بۆرژوازی، لە پێناوی ڕزگاری

خۆیدا, یانی لە سەدەی سیانزەهەمەوە تا ئەگاتە کۆتایی سەدەی هەڤدەهەم, ئەم ڕەنگەی لە خۆ گرتبوو. هۆکاری ئەم مەسەلەیەش بە پێچەوانەی ئەوەی کە فۆیرباخ پێی وابوو, بە خەسڵەتی دڵی مرۆڤ و پێویستییە ئایینییەکانی لیکنادرێتەوە, بەڵکوو بە تێکڕای مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست, کە جگە لە یەك شێوە ئایدیۆلۆژی یانی ئایین و لاهوت, بە چتێکی دی ئاشنا نەبووە, لێکئەدرێتەوە. بەڵام کاتێك کە بۆرژوازی لە سەدەی هەژدەیەمدا, بە ئەندازەی پێوست هێزێکی وای پەیداکرد کە بتوانێت ئایدیۆلۆژیایەکی تایبەت بە خۆی هەبێت, کە هاوشانی هەلومەرجی چینایەتی خۆی بێت, ئەو کاتە شۆڕشی مەزن و تەواوی خۆی یانی شۆڕشی فەرەنسای ئەنجام دا, ئەو ئایینی, تەنها بە پشتبەستن بە بیروباوەڕی حقوقی و سیاسی, بە لاوە گرنگ نەبوو, مەگەر بەو ڕادەیەی کە ئایین, کۆسپی لە ڕێگایدا پێکهێنابێت. بەڵام بۆرژوازی تەنانەت بە خەیاڵیشیدا نە ئەهات کە لە جێی ئایینی کۆن, ئایینێکی نوێ دابنێ. ئاشکرایە کە ڕۆبسپیر لەم ڕووەوە تووشی چ ناکامییەك هات (١٣).

لە کۆمەڵگایەکدا کە ئێستا ئێمە بە ناچاری ژیانی تێدا بەسەر ئەبەین و لەسەر ناکۆکی چینایەتی و دەسەڵاتی چینایەتی بنیاتنراوە, توانای دەربڕینی هەستە پەتییە مرۆڤایەتییەکان سەبارەت بە پەیوەندییەکانی خۆمان بە کەسانی دیکەوە, بە ڕادەیەکی یەکجار کەمە, بچوکترین هۆکارێك بەدەستەوە نییە کە هەمدیسانەوە, ئەو توانایییە کەمتر بکەینەوە, ئەوەش بە بڵندکردنەوەی ئەو هەستانە بۆ ئاستی ئایین. بەم شێوەیە, زانستی مێژووی باو بە تایبەت لە ئەڵمانیا, تێگەییشتنی ئێمەی بۆ جەنگە چینایەتییە مێژووییە گەورەکان تاریك کردووە و پێویست بەوە ناکات ئەم تێگەییشتنە بە یەکجاری بکەینە شتێکی مەحاڵ لە ڕێگای گۆڕینی





مێژووی ئەم خەباتەوە, ئەویش بەوەی کە بکرێتە پاشکۆیەکی سادەی مێژووی کڵێسا. هەر لێرەوە دەبینین کە ئەمڕۆ ئێمە چەندە لە فۆیرباخ دوورکەوتووینەتەوە. ئێستا تەنانەت خوێندنەوەی لایەنە "زۆر جوان"ەکانی دانراوەکانی فۆیرباخ کە تیایدا ئایینی نوێی خۆشەویستی هەڵئەنێ, ئەستەمە.

تەنها ئایینێك کە فۆیرباخ بە قووڵی لێی کۆڵیبێتەوە, ئایینی مەسیحی بووە, ئایینی جیهانیی ڕۆژئاوا, کە لەسەر بنەمای یەکتاپەرستی بنیاتنراوە. فۆیرباخ ئەوە پیشان ئەدات کە خودای مەسیحییەت, جگە لە ڕەنگدانەوەی خەیاڵی مرۆڤ شتێکی تر نییە. بەڵام ئەم خودایە بە نۆبەی خۆی, بەرهەمی بزووتنەوەیەکی دوورودرێژی تەجرید و چڕبوونەوەی ژمارەیەکی زۆروزەبەندی خودایانی کۆنی خێڵ و میللەتانە. بە هەمان شێوە, ئەو مرۆڤەی کە ئەم خودایە ڕەنگدانەوەی ئەوە, مرۆڤێکی واقیعی نییە, بەڵکوو ئەویش کورتکراوە و چڕبووەوەی ژمارەیەکی زۆری مرۆڤگەلی واقیعییە, ئەم مرۆڤە مرۆڤێکی تەجریدییە, یانی ئەمیش وێنایەکی فیکرییە. خودی فۆیرباخیش کە لە هەموو لاپەڕەیەکدا وەعزی ئەوە ئەدات, کە ڕۆچینە نێو ئارەزووە جەستەییەکان و داوامان لێ دەکات کە نوقمی جیهانی مەلموس و واقیعی بین, کاتێك کە ناچار دەبێت قسە, نەك سەبارەت بە پەیوەندی سێکسی, بەڵکوو سەبارەت بە پەیوەندی تری نێوان مرۆڤەکان بکات, لە ڕادەبەدەر ئەکەوێتە نێو تەجریدەوە.

فۆیرباخ لە هەموو ئەو پەیوەندییانەی کە لە نێوان مرۆڤەکاندا هەیە, جگە لە لایەنێك کە ئەویش, ڕەووشتە, شتێکی تر نابینێت. لێرەدا جارێکی تر هەژاریی سەرسوڕهێنەری فۆیرباخ بە بەراورد لەگەڵ هیگڵ, سەرسامان ئەکات. بەلای هیگڵەوە, زانستی ڕەووشت, یان تیۆرەکەی لە مەڕ ڕەووشت,

فەلسەفەی مافە, کە بریتییە لەمانە: ١_مافی موجەرەد ٢_ ڕەووشت ٣_ مەیدانی ڕەووشت کە ئەویش بە نۆبەی خۆی ئەمانە ئەگرێتەوە: خێزان, کۆمەڵگای مەدەنی, دەوڵەت. لێرەدا, بە هەر ئەندازەیەك شێواز ئایدیالیستییە, بە هەمان ئەندازە ناوەڕۆك ڕیالیستییە. ئەم ناوەڕۆکە سەرباری ڕەووشت, تێکڕای مەیدانی ماف و ئابوری و سیاسەت ئەگرێتەوە. بەڵام بەلای فۆیرباخەوە مەسەلەکە بە تەواوی پێچەوانەیە. فۆیرباخ لە ڕووی شێوازەوە ڕیالیستییە و مرۆڤ خاڵی لێوە هەستانییەتی, بەڵام هیچ قسەیەك دەربارەی جیهانێك کە ئەو مرۆڤە زیندەگی تێدا ئەکات ناهێنێتە گۆڕ, لەبەر ئەوە مرۆڤ بەلای فۆیرباخەوە بە هەمان ئەو مرۆڤە موجەرەدەی کە لە فەلسەفەی ئاییندا دەبینریٚ, دەمێنێتەوە. ئەو مرۆڤە لە سکی دایکەوە پەیدا نەبووە, بەڵکوو هەروەکوو چۆن پەروانە لە قۆزاخە دێتە دەرەوە, لە خودای ئایینە یەکتاپەرستییەکانەوە هاتۆتە دەر. لەبەر ئەوە, ئەو مرۆڤە لە جیهانی واقیعی کە خاوەن پەرەسەندنی مێژوویی و سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراوە, ناژێت. ئەگەرچی تێکەڵی لەگەڵ خەڵکانی تردا هەیە, بەڵام هەر یەکێك لەو خەڵکانە بە ڕادەی خودی ئەو موجەرەدە. لە فەلسەفەی ئاییندا, بەلای کەمەوە, ژن و پیاو لەیەك جیا ئەکەینەوە. بەڵام لە ڕەووشتدا, ئەم جیاوازییە دەپووکێتەوە. ئەوە ڕاستە کە لە لای فۆیرباخ بە دەگمەن بابەتگەلی وەکوو ئەمەی خوارەوە بەرچاو ئەکەوێت:

"لە کۆشکەکاندا بە جۆرێکی تر وەك لەوەی لە کۆلیتەکاندا هەیە بیر ئەکرێتەوە", "ئەگەر بەهۆی برسێتی و کوێرەوەری, هیچ مەوادێکی خۆراکی لە لەشتدا نەبوو, ئەوا لە مێشك و هەست و دڵیشتدا, هیچ خۆراکێکت بۆ ڕەووشت پیٚ نابێت", "ئەبیٚ سیاسەت ببێتە ئایینمان" ...هتد.





بەڵام فۆیرباخ بە هیچ جۆرێك ناتوانێت ئەم بابەتگەلانە بەکار بهێنیٚ, لە لای ئەو, ئەوانە تەنها دەربڕینن و تەنانەت شتارکە ناچارە دان بەوەدا بنێت کە, سیاسەت لەلای فۆیرباخ مەیدانێکە, دەستڕاگەییشتن پێی ئەستەمە و "زانست دەربارەی کۆمەڵ وەیان سۆسیۆلۆژی_ terra incognita"[10].

لەو جێگایەدا کە فۆیرباخ ناکۆکی نێوان خێر و شەڕ لێکئەداتەوە, بە هەمان ئەندازە, تێگەییشتنی ڕووکەشییانەی فۆیرباخمان بە بەراورد لەگەڵ هیگڵ بۆ دەرئەکەویٚ.

هیگڵ ئەنووسێت: "کەسانێك هەن پێیان وایە ئەگەر بڵێن: مرۆڤ بە پێی سرووشتی خۆی خێرەومەندە, ئەوا بیرۆکەیەکیان خستۆتە ڕوو, یەکجار قووڵ, بەڵام ئەوە فەرامۆش ئەکەن کە لە ڕستەی: مرۆڤ بە پێی سرووشتی خۆی شەڕەنگێزە, بیرۆکەیەکی زۆر قووڵتر هەیە".

شەڕ بەلای هیگڵەوە ئەو فۆرمەیە کە هێزی بزوێنەری پەرەسەندنی مێژوویی تێدا بەرجەستە بووە. ئەم بیرۆکەیەش دوو واتای هەیە: لە لایەکەوە, هەر هەنگاوێکی تازە بۆ پێشەوە, بە ناچاری وا ئەنوێنێت کە سوکایەتییە بە یەکێك لە شتە پیرۆزەکان, یاخیبوونە لە دژی هەلومەرجی کۆن و بەسەرچوو, بەڵام پیرۆز بەهۆی نەریتەوە. لە لایەکی ترەوە, لەو کاتەوەی کە ناکۆکی نێوان چینە کۆمەڵایەتییەکان پەیدابووە, ئاشوبی ناپەسەندی مرۆڤ, وەکوو, چاوچنۆکی, دەسەڵاتخوازی, بوونەتە نوێڵی پەرەسەندنی مێژوویی. بۆ نموونە, مێژووی فیوٚدالیزم و بۆرژوازی, سەڵمێنەری هەمیشەیی ئەم مەسەلەیەن. بەڵام تەنانەت ئەوە بە مێشکی فۆیرباخدا نەهاتووە کە, لە

[10] سەرزەمینێکی ونە. (و. عەربی).

رۆڵی مێژوویی شەڕی ئەخلاقی بکۆڵێتەوە. بە شێوەیەکی گشتی, مەیدانی مێژوو بۆ فۆیرباخ, شیا و ئاسودە نییە. تەنانەت ئەم وتەیەی:

"ئەو دەمەی کە مرۆڤ لە دامێنی سرووشتەوە هاتە دەرەوە, جگە لە بوونەوەرێکی سروشتیی پەتیی, نەك مرۆڤ, شتێکی تر نەبوو. مرۆڤ بەرهەمی مرۆڤ و فەرهەنگ و مێژووە".

تەنانەت ئەم قسەیەش لە لای فۆیرباخ, قسەیەکی بێبەرهەم بوو.

پاش هەموو ئەو شتانەی کە وترا, ئێستا ئەوە ڕۆشنە کە ئەو قسانەی فۆیرباخ دەربارەی ڕەووشت بە ئێمەی ئەڵێ, شتگەلێکی زۆر چروساوەیە[11]. لە لای مرۆڤ, تێکۆشان لە پێناوی بەختەوەرییدا, شتێکی خۆڕسکە, هەر بۆیە, ئەبێ ئەم تێکۆشانە ببێتە بناغەی ڕەووشت. بەڵام ئەم تێکۆشانە لە پێناوی بەختەوەریدا, لە دوو ڕووەوە مل بۆ ڕاستکردنەوە کەچ ئەکات. یەکەم, لە ڕووی سەرئەنجامە سرووشتییەکانی کردارەکانمانەوە: لە پاش مەستی ژانەسەر و لە پاش زێدەڕۆیی کە ئەبێتە خوو, نەخۆشی دێت. دووەم, لە ڕووی سەرئەنجامە کۆمەڵایەتییەکانی کردارەکانمانەوە: ئەگەر ئێمە ڕێز لە هەمان ئەو تێکۆشانەی کە کەسانی دیکە بۆ بەختەوەریی ئەیدەن, نەگرین, ئەوا ئەوان بەرگری ئەکەن و دەبنە کۆسپی بەردەم تێکۆشانی ئێمە لە پێناوی بەختەوەریدا. لێرەوە ئەو ئەنجامگیرییە بەدەستدێت, ئەگەر ئێمە خوازیاری ئەوەین کە تێکۆشانمان لە پێناوی بەختەوەریدا سەرکەوتوو بێت, پێویستە بزانین کە چۆن بە شێوەیەکی دروست سەرئەنجامی کارەکانمان هەڵئەسەنگێنین و سەرباری ئەوەش ڕێز لە مافی کەسانی دیکە, کە هەمان تێکۆشانیان هەیە, ئەگرین. کەواتە, ڕێسای بنەڕەتیی ڕەووشت لە لای

11 هزیل, لاواز. (و. کوردی).



فۆیرباخ, کە هەموو ڕێساکانی تری لێوە هەڵئەگۆزن بریتییە لە, بەرتەسککردنەوەی عەقڵانییانە سەبارەت بە خۆمان و بە خۆشەویستی[12] (هەمیشە خۆشەویستی!) لە پەیوەندیمان بە کەسانی دیکەوە. نە پاساوە زۆر هۆشمەندانەکانی فۆیرباخ, نە پیاهەڵدانە زێدەڕۆییەکانی شتارکە, ناتوانن هیچوپوچی ئەم دوو و سێ حوکمە بشارنەوە.

ئەگەر مرۆڤ بایەخی هەر بە خۆی دا, ئەوا تەنها لە هەندێك حاڵەتی زۆر کەمدا, کە ئەویش بە هیچ جۆرێك کەڵکی نە بۆ خۆیی و نە بۆ کەسانی دیکەش ئەبێت, ئەتوانێت سەرکەوتن لەو کۆششەی لە پێناوی بەختەوەریدا ئەیکات, بەدەستبهێنێ. پێویستە ئەو لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا پەیوەندی بگرێت و بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی خۆی, خاوەنی هۆیەکانی وەك: خۆراك, هاوسەر, پەڕاو, گفتوگۆ, وتووێژ, چالاکی, شتومەکی بەکاربردن بۆ ژیان و شتومەکی کار, بێت. لە دوو حاڵەت بەدەر نییە: یان ئەوەتا گریمانەی ڕەووشت لە لای فۆیرباخ هەر لە سەرەتاوە, گریمانەی ئەوە دائەنێت کە, هەموو ئەو شتومەك و هۆیانە بێئەملاوئەولا لە بەردەستی هەموو مرۆڤێکدایە, وەیان ئەوەتا ئەو ڕەووشتە بە تەنها, ئامۆژگاریی جوان فەرماییش ئەکات, کە نایاتە دی و لە لای کەسانێك کە لەو هۆیانە بێبەشن, بەهای تاڵە موویەکی نییە.

لەم بارەوە, خودی فۆیرباخ بە ڕاشکاوی ئەڵێت:

"لە کۆشکەکاندا بە جۆرێکی تر وەك لەوەی لە کۆلیتەکاندا هەیە بیر ئەکرێتەوە", "ئەگەر بە هۆی برسێتی و کوێرەوەری, هیچ مەوادێکی

12 ئەوین, ئەشق, حب. (و. کوردی).





خۆراکی له لەشتدا نەبوو, ئەوا له مێشك و هەست و دڵیشتدا, هیچ خۆراکێکت بۆ ڕەووشت پێ نابێت".

ئایا, سەبارەت بە مافی یەکسان له بەختەوەریی بۆ گشت کەسێك, هەلومەرجێکی باشتر لەوە له ئارادایە؟ فۆێرباخ ئەم مافە بە بێ قەید و مەرج داوا ئەکات و پێی وایە کە له هەموو سەردەم و بارودۆخێکدا پێویستە. بەڵام له کەیەوە تێکڕای خەڵکی, دان بەم مافەدا ئەنێن؟ ئایا له سەردەمەکانی ڕابردوودا هیچ کاتێك, مافی یەکسان له بەختەوەریی بۆ گشت کەسێك, له نێوان کۆیله و کۆیلەداران, وەیان له سەدەکانی ناوەڕاست, له نێوان سێرفەکان[13] و بارۆنەکان[14], بۆتە جێگەی قسەوباس؟ ئایا تێکۆشانی چینە ستەمکێشەکان له پێناوی بەختەوەرییدا, بێبەزەییانە و "بە پێی یاسا" نەبۆتە قوربانی هەمان ئەو تێکۆشانەی کە چینە دەسەڵاتدارەکان له پێناوی بەختەوەریدا ئەی دەن؟ بەڵێ بەو جۆرە بوو, بەڵام ئەمە پێچەوانەی ڕەووشت بوو, بەڵام ئەمڕۆ مافی بەرابەر, دانی پیادا نراوە. تەنها بە قسە دانی پێدا نراوە, ئەویش لەو کاتەوەی کە بۆرژوازی ناچار بوو, له تێکۆشانیدا دژی فیۆدالیزم و بۆ پەرەپێدانی بەرهەمی سەرمایەداری, تەواوی ئیمتیازاتی پلەوپایەکان ("مراتب". و. کوردی), یانی ئیمتیازاتە کەسایەتییەکان, لەنێوبەرێت و بەرابەریی له مافە دادوەرییەکان بۆ تاك,

[13] Serf وشەیەکی فەرەنسییە, بە واتای ئەو جوتیارانەی کە له سەدەکانی ناوەڕاست, له زەوی خاوەنزەوییە گەورەکان کاریان کردووە. بە کوردی: سەپان, بە عەرەبی: فلاح القن. (و. کوردی).

[14] Baron وشەیەکی فەرەنسییە, نازناوێکە له نازناوەکانی خانەدان و پیاوماقوڵە خاوەن زەوییە گەورەکانی ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاست. (و. کوردی).



سەرەتا له چوارچێوەی مافە تایبەتییەکان و پاشانیش وردەوردە له مەیدانی مافەکانی دەوڵەت ("مافە گشتییەکان" بە پێی دەقە فارسییەکە. و. کوردی), بڕیار بدات.

بەڵام مافە ئایدیالە خۆراکییەکان شتگەلێکی زۆر کەمن بۆ تێکۆشان له پێناوی بەختەوەریدا. تێکۆشان له پێناوی بەختەوەریی له هەموو شت زیاتر له ڕێگەی هۆیە مادییەکانەوە ئەچێتە سەر و بەرهەمهێنانی سەرمایەداری له سۆنگەی ئەمەوەیە کە هەوڵ ئەدات تاوەکوو زۆربەی هەرە زۆری ئەو تاکانەی کە مافی یەکسانیان هەیە, تەنها خاوەنی شتگەلێکی کەمی زۆر پێویست بن, کە بۆ ژیانێکی پڕ له کوێرەوەری پێویستن. بەم شێوەیە, ئەوە جێگەی گومانە کە سەرمایەداری ڕێزێکی زیاتر له مافی یەکسانی زۆربە بگرێت بۆ بەختەوەری, وەك لەوەی کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتی گرتوویانە. ئایا هەلومەرجێکی باشتر له پەیوەند بە هۆیە ڕۆحییەکان بۆ فەراهەمکردنی بەختەوەریی, هەروەها هۆیەکانی فێرکردن, له ئارادایە؟ مەگەر خودی "ئەو مامۆستای خوێندنگا سەرەتاییەی کە له جەنگی سادوا سەرکەوت" (١٤) کەسایەتییەکی ئەفسانەیی نەبوو؟

لەوانەش زیاتر. بە پێی تیۆری ڕەووشتی فۆێرباخ, بۆرسە[15] بەرزترین پەرستگای ڕەووشتە, ئەگەر بێتو ژیرانە سەوداگەری بەڕێوە بچێت. ئەگەر تێکۆشانی من له پێناوی بەختەوەری بەرەو بۆرسەم ببات و ئەگەر بزانم لەوێدا سەرئەنجامی کارەکانم بە دروستی سەنگوپێوانە بکەم, بە جۆرێك کە ئەم کارانە بۆ من جگە له خۆشی, شتێکی ترم بۆ نەهێنێ و هیچ جۆرە

[15] Bourse وشەیەکی فەرەنسییە, یانی بازاڕی کڕین و فرۆشتنی پارەوپول. (و. کوردی).





زیانێکم پێ نەگەیەنێت, یانی ئەگەر من هەمیشە قازانج بکەم, ئەو دەمە ئامۆژگارییەکەی فۆێرباخ دێتەدی. بڕوانن کە من لەم بارەیەوە بە هیچ جۆرێك کۆسپ ناخەمە بەردەم هاوشێوەی خۆم کە بۆ بەختەوەریی تێئەکۆشێت. هاوشێوەکەمیش هەروەکوو من, بە ویستی خۆی بۆ بۆرسە هاتووە. ئەو کە مامەڵەی کێبەرکێم لەگەڵدا ئەکات, بە هەمان شێوەی من بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەریی تێئەکۆشێت. ئەگەر پارەکانی دۆڕاند, ئەوە نیشانەی بێڕەووشتی کردارەکانییەتی, چونکە سەرئەنجامی کردارەکانی نادروست هەڵسەنگاندووە. من ئەتوانم ئەو بە سزای شاییستەی خۆی بگەیەنم, تەنانەت ئەتوانم بە ناونیشانی ڕادامانت (١٥)ی هاوچەرخ, سەربەرزانە سینگی خۆم دەرپەڕێنم. لە بۆرسەدا تەنانەت خۆشەویستیش دەستەواژەیکی سۆزیی پەتی نییە, بەڵکوو فەرمانڕەوایە, لەبەر ئەوە هەریەکە بە کۆمەکی کەسانی تر, تێکۆشانی خۆی لە پێناوی بەختەوەریدا بە سەرکەوتن ئەگەیەنێت, ئەمە ڕێك ئەو شتەیە کە پێویستە خۆشەویستی بیکات و جێبەجێبوونی بە کردەوەی خۆشەویستیش لەو چوارچێوەیەدا خۆی ئەبینێتەوە. لەبەر ئەوە ئەگەر من سەرئەنجامی کارەکانی خۆمم بە دروستی پێشبینی کرد, یانی ئەگەر سەرکەوتوانە یاریم کرد, ئەوکاتە بە دڵنیاییەوە پابەندی گشت خواستە ئەخلاقییەکانی فۆێرباخ ئەبم, سەرباری ئەوەش دەوڵەمەند ئەبم. بە مانایەکی تر, مەبەست و ئارەزووەکانی فۆێرباخ هەرچییەك بن, ڕەووشتەکەی لەسەر شێوەی کۆمەڵگای سەرمایەداری ئەمڕۆ بڕاوە.

بەڵام خۆشەویستی! بەڵێ, خۆشەویستی بەلای فۆێرباخەوە هەمیشە و لە گشت شوێنێك موعجیزە دروست ئەکات و پێویستە مرۆڤ لە هەموو دژوارییەکانی ژیانی عەمەلی ڕزگار بکات_ ئەمە دەربارەی کۆمەڵگایەکە



کە بۆ چینە بەرژەوەند ناکۆکەکان دابەش بووە! بەم جۆرە, فەلسەفەکەی فۆێرباخ دوا مۆرکی شۆڕشگێڕانەی خۆی کە ماوەتەوە لە دەست ئەدات و تەنها گۆرانییەکی کۆن ئەمێنێتەوە کە ئەڵێت: یەکتریتان خۆشبوێت, بە بێ جیاوازی لە پلەوپایە و جنس, یەکتری لە باوەش بگرن, ژیانێکی ئاشتییانە, ئاشتییەکی گشتی, بەرپا بکەن! بە کورتییەکەی, ئەوەی بەسەر تیۆری ڕەووشتی فۆێرباخدا هاتووە, هەمان ئەو شتەیە کە بەسەر تێکڕای تیۆرەکانی پێشیندا هاتوون. ئەم ڕەووشتە بە بەر هەموو سەردەمێك و هەموو گەلێك و هەموو هەلومەرجێدا بڕاوە, ڕێك لەبەر ئەوە, لە هیچ کات و لە هیچ شوێنێکدا بۆ جێبەجێکردن دەستنادات. ئەم ڕەووشتە بە هەمان ئەندازەی حوکمی ئیمپراتیڤ (بڕێنەرەوە/ و. کوردی)ی هیگڵ, لە بەرامبەر جیهانی واقیعی دەستەوەستانە. لە ڕاستیدا هەر چینێك و تەنانەت هەر پیشەیەکیش ڕەووشتی تایبەتی خۆی هەیە, سەرباری ئەوە هەرکاتێك بزانێت ڕووبەڕووی سزا نابێتەوە, لە دژی ئەوەستێتەوە. بەڵام لە پەیوەند بە خۆشەویستییەوە کە پێویستە هەموو شتێك یەکگرتوو بکات, بە شێوەی جەنگ, ناکۆکی, سکاڵا, ناکۆکی خانەوادەگی, تەڵاق و چەوسانەوەی هەندێك بۆ هەندێکی تر, دەرئەکەوێ.

ئیتر چۆن ئەبێ کە, ئەو تەکانە بەهێزەی فۆێرباخ بە بزووتنەوەی هزریی دا, بۆ خۆی بە تەواویی بێبەرهەم بێت؟ زۆر بە سادەیی, لەبەر ئەوەی فۆێرباخ ئەو ڕێگایەی کە لە جیهانی تەجریدییەوە کە خودی فۆێرباخ هەتاوەکوو مردن نەفرەتی لێ کرد, بەرەو جیهانی زیندووی واقیعی ئەبرد, نەدۆزییەوە. ئەو بە هەموو هێزێکییەوە خۆی بە سرووشت و مرۆڤەوە چەسپاندبوو. بەڵام سرووشت و مرۆڤ لە لای ئەو, جگە لە دوو وشە, شتێکی دی نەبوون. ئەو لەسەر سرووشتی واقیعی و مرۆڤی واقیعی نەی ئەتوانی





شتێکی ڕۆشن بڵێت. بۆ ئەوەی لە مرۆڤێکی موجەڕەدەوە هەروەکوو فۆێرباخ وێنای ئەکرد, بگەینە مرۆڤێکی زیندووی واقیعی, پێویستە ئەو مرۆڤانە لە کردارە مێژوویییەکانیانەوە لێیان بکۆڵدرێنەوە. بەڵام فۆێرباخ بە توندی لە دژی ئەوە وەستایەوە, لەبەر ئەوە ساڵی ١٨٤٨ (١٦) کە لیێی تێناگات, هیچ مانایەکی نەبوو, جگە لە داپچڕانی یەکجارەکی لەگەڵ جیهانی واقیعی و چوونە نێو گۆشەگیری تەواوەتی, نەبێت. تاوانی ئەمەش بە شێوەیەکی سەرەکی هەمدیسان, ئەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ئەڵمانیا, کە ئەوی بە ئەنجامێك گەیاند جێگای بەزەیی بێت.

بەڵام ئەو هەنگاوەی کە فۆێرباخ نەی نا, لەگەڵ ئەوەشدا ئەبێ بنرێت. پێویستە پەرستنی مرۆڤی موجەڕەد کە ناوکی ئایینی نوێی فۆێرباخی پێکئەهێنێ, بە زانستێك بگۆڕدرێت, کە پەیوەندە بە خەڵکی واقیعی و پەرەسەندنی مێژوویییانەوە. ئەم پەرەسەندنەی دوایی تیۆری فۆێرباخ, کە چوارچێوەی فەلسەفەی فۆێرباخی بڕی, مارکس, لە ساڵی ١٨٤٥, لە پەڕاوی "خێزانی پیرۆز"دا دەستی پێ کرد.





## بەشی چوارەم: مارکس

شتراوس, باوێر, شتیرنەر و فۆیرباخ, تا ئەو جێگایەی کە مەیدانی فەلسەفەیان بەجێ نەهێشتووە, نەوەکانی فەلسەفەی هیگڵی بوون. شتراوس لە پاش ئەو دوو پەڕاوەی "ژیانی مەسیح" و "دۆگماتیك", زیندەگی خۆی بۆ ئەدەبیاتی فەلسەفی و مێژوویی کلێسایی بە شێوازی ڕینانی تەرخان کرد. هەرچی باوێرە, بە تەنها لە بواری سەرهەڵدانی مەسیحییەتدا, تا ڕادەیەك کاری پڕ بایەخی ئەنجام دا. شتیرنەر, تەنانەت پاش تێکەڵکردنی باکۆنین و پرۆدۆن لەگەڵ یەکتر و لە ئاو هەڵکێشانی (تعمید) ئەم تێکەڵکردنە بە ناوی "ئەنارشیزم" ەوە, هەروەکوو ڕووداوێکی خۆشی گاڵتەئامێز مایەوە. بە تەنها فۆیرباخ فەلسەفەکارێکی بەرجەستە بوو. بەڵام فۆیرباخ نەك هەر نەیتوانی لە چوارچێوەی فەلسەفەیەك کە خۆی بە زانستی زانستەکانی لە قەڵەم ئەدا و بەسەر هەموو زانستەکاندا دەفڕێ و لە یەکەیەکدا کۆیان دەکاتەوە, تێبپەڕێت (چونکە ئەم فەلسەفەیە لە ڕوانگەی فۆیرباخەوە هەروەك شتێکی پیرۆز کە نابێت دەستی لێ بدرێت, مایەوە), بەڵکوو تەنانەت بە ناونیشانی فەیلەسوفێکیش لە نیوەی ڕێدا وەستا. فۆیرباخ لە ژێرەوە ماتریالیست و لە سەرەوە ئایدیالیست بوو. فۆیرباخ نەیتوانی بە چەکی ڕەخنە بە سەر هیگڵدا زاڵ بێت, بەڵکوو ئەو ئەوی وەك شتێکی وەها کە بۆ بەکارهێنان ناشێت خستە کەنارەوە, لە کاتێکدا خودی خۆی نەی ئەتوانی لە بەرامبەر سامانی دەوڵەمەندی ڕێبازی هەمەلایەنەی هیگڵی, جگە لە ئایینی فشەڵی ئەوین و ڕەووشتی لاواز و زەبوون, هیچ شتێکی پۆزەتیف بهێنێ.





بەڵام لەگەڵ پوکانەوەی قوتابخانەی هیگڵیدا, ئاراستەیەکی تریش پەیدا بوو, کە تاقە ئاراستە بوو بە ڕاستیی بەرهەمێك بێنێتە بەر, ئەم ئاراستەیەش بە شێوەیەکی گشتی, بە ناوی مارکسەوە پەیوەستە[١٦].

لێرەدا دابڕانێك لە فەلسەفەی هیگڵ, لە ڕێگای گەڕانەوە بۆ ڕوانگەی ماتریالیستی, هاتەکایەوە. ئەمە مانای وایە, پشتیوانانی ئەم ئاراستەیە بڕیاریان داوە جیهانی واقیعی_سرووشت و مێژوو_ هەر بەو جۆرەی کە لە دیدی هەموو ئەوانەی بە بێ قبوڵکردنی پێشوەختی خەیاڵاتی ئایدیالیستی تێی ئەڕوانن, درك بکەن, ئەوانە بڕیاریان داوە, هەموو ئەو خەیاڵە ئایدیالیستییانەی کە جووت نایاتەوە لەگەڵ ئەو واقیعەتانەی لە

16 لێرەدا یارمەتی وەرئەگرم کە ڕوونکردنەوەیەکی شەخسی بدەم, لەم دواییانەدا گەلێك جار ئاماژە بە بەشداری من لە دانانی ئەم تیۆرییە ئەکرێت. لەبەر ئەوە لێرەدا من بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو مەسەلەیە بە ناچاری ئەبێ چەند وشەیەك بڵێم. من ناتوانم نکۆڵی لەوە بکەم کە چ پێشتر و چ لە سەردەمی کاری هاوبەشی چلساڵەم لەگەڵ مارکسدا, بەشداریی تاڕادەیەك سەربەخۆم هەبووە, چ لە دانانیدا بە تایبەت, چ لە جێگیرکاری ئەو تیۆرەی کە باسی لێ ئەکەین. بەڵام بەشی گەورەی بیرۆکە بنەڕەتییە ڕێنموونییەکان, بە تایبەت لە مەیدانی ئابووری و مێژووییدا, لەوەش زیاتر لە فۆرمۆلبەندیکردنی ڕۆشن و یەکجاریی, بۆ مارکس ئەگەڕێتەوە. ئەوەش کە من بەشداریم تێیدا هەبووە, ئەوا مارکس زۆر بە ئاسانی ئەیتوانی_ ڕەنگە دوو سێ مەیدانێکی تایبەتی لی ٚ دەرکەی_ بە ئەنجامی بگەیەنێ. بەڵام ئەوەی کە مارکس ئەنجامی داوە, من هەرگیز ناتوانم ئەنجامی بدەم. مارکس لە هەموومان باڵاتر بوو, لە هەموومان دووربینتر و فراوانتر و خێراتر ئەی ڕوانی. مارکس بلیمەت بوو, بەڵام ئێمە ئەوپەڕەکەی بەهرەمەندێك بووین. ئەگەر ئەو نەبوایە, ئەوا تیۆرەکەمان بە هیچ جۆرێك ئەمەی ئێستا نە ئەبوو. لەبەر ئەوە, بە ڕاستی شایانی خۆیەتی کە ئەم تیۆرییە ناوی ئەو هەڵگرێ.

پەیوەندییەکی تایبەتییدان لەگەڵی نەك لە پەیوەندییەکی خەیاڵی, بە بێ زەبیانە, بکەنە قوربان. ماتریالیزمیش بە شێوەیەکی گشتیی جگە لەمە, مانایەکی دیکەی نییە. جیایی ڕێبازی تازە بە تەنها لەوەدا بوو کە, بۆ یەکەمین جارە سەبارەت بە تێگەییشتنی ماتریالیستیی بۆ جیهان, شێوازێکی جیدی بگیردرێتە بەر و بە شێوەیەکی هاوئاهەنگ, لە هەموو ئەو مەیدانانەی کە قسەوباسی لەسەر ئەکەین, جێبەجێ بکرێـ بە لانی کەمەوە لە ڕووی هێڵە گشتییەکانییەوەـ.

هەروا بە سوك و سانایی, هیگڵ نەخرایە کەنارەوە. بەڵکوو بە پێچەوانەوە, لایەنە شۆڕشگێڕییەکانی فەلسەفەکەی, کە لە سەرەوە باسمان کرد, واتە میتۆدە دیالێکتیکییەکەی ئەو, کرایە خاڵی دەسپێك. بەڵام ئەم میتۆدە بە شێوازە هیگڵییەکەی, بێ کەڵك بوو. دیالێکتیك لە لای هیگڵ بریتییە, لە پەرەسەندنی خۆبەخۆی بیرۆکە. بیرۆکەی ڕەها ـ نازانین لە کوێـ نەك هەر لە ئەزەلەوە هەیە, بەڵکوو ڕۆحی حەقیقی و زیندەگییبەخشی تەواوی ئەم جیهانەیە. ئەم بیرۆکەیە بۆ ئەوەی بۆ خودی خۆی بگەڕێتەوە, لە میانەی هەموو ئەو قۆناغە سەرەتاییانەوە کە لە پەڕاوی "لۆژیك"دا بە دریژی روون کراونەتەوە, کە ئەو قۆناغانەش لە نێو بیرۆکەکە دان, پەرەئەستێنێ. پاشان ئەم بیرۆکە ڕەهایە دوای ئەوەی بە خۆی "نامۆ ئەبێت", خودی خۆی "ئەگوازێتەوە" و بۆ سرووشت ئەگۆڕێت, بە بێ ئەوەی ئاگاییەکی لە خۆی هەبێت, پاش ئەوەی شێوەی پێویستی سرووشتی بە خۆ گرت, بە پەرەسەندنێکی نوێدا تێ ئەپەڕێت و سەرئەنجام لە وجودی مرۆڤدا سەرلەنوێ بە خودئاگایی ئەگات. بەڵام ئەم خودئاگاییە لە میژوودا جارێکی دی لە حاڵەتی بەرایی قوتار دەبێت تا ئەو دەمەی سەرئەنجام لە فەلسەفەی هیگڵ بیرۆکەی ڕەها بە تەواویی بۆ خودی خۆی دەگەڕێتەوە. پەرەسەندنی





دیالێکتیکی, کە لە سرووشت و مێژوودا دەرئەکەوێت, واتە پەیوەندی هۆکاریی (السببیة/ و. کوردی) ئەو بزووتنەوە پێشڕەوەندەی کە لە میانەی هەموو پێچ و پەنا و هەر هەنگاوگەڵێکی کاتیی بەرەوپاش, ڕێگە بۆ خۆی دەکاتەوە کە لە خوارەوە بەرەو سەرەوە پەرەبسێنێ, بە لای هیگڵەوە تەنها ڕەنگدانەوەی بزاوتی خۆبەخۆی بیرۆکەیە کە لە ئەزەلەوە لە شوێنێکی نەزانراوەوە, بەڵام سەربەخۆ لە هەر مێشکێکی بیرکەرەوەی مرۆیی لە ڕەوت دایە. ئەم شێواندنە فیکرییە ئەبوو لە نێو ببرێت. کاتێ ئێمە بۆ ڕوانگەی ماتریالیستی گەڕاینەوە, سەرلەنوێ لە بیرۆکە مرۆییەکاندا, ڕەنگدانەوەی شتگەلە واقیعییەکانمان بینی, ئەمە لە جیاتی ئەوەی لە شتگەلە واقیعییەکاندا ڕەنگدانەوەی ئەم یان ئەو قۆناغە لە بیرۆکەی ڕەها ببینین. بەم جۆرە دیالێکتیك بووە زانستی یاسا گشتییەکانی بزووتنەوە چ لە جیهانی دەرەوە, یان لە بیرۆکەی مرۆییدا: لێرەدا دوو کۆمەڵە یاسا هەن کە لە ناوەرۆکدا وەك یەکن, بەڵام لە دەربڕینیاندا لێك جودان, واتە, مێشکی مرۆیی دەکارێت کە بە هوشیارییەوە پیادەیان بکات, لە کاتێکدا ئەوان لە سرووشتداـ هەتا هەنووکە, زۆرجار لە مێژووی مرۆییشداـ بە بێ ئاگایانە, بە شێوازی پێویستییەکی دەرەکی, لە میانەی زنجیرەیەکی بێ پایان لە ڕێگای ڕێکەوتی ڕوکەشەوە, ڕێگای خۆیان ئەدۆزنەوە. بەم شێوەیە خودی دیالێکتیکی بیرۆکەکان, جگە لە ڕەنگدانەوەی هوشیارانەی بزووتنەوەی دیالێکتیکی جیهانی واقیعی شتێکی تر نییە. هاوشانی ئەمە, دیالێکتیکی هیگڵی سەرەوخوار بووەوە, بە واتایەکی دروستتر, سەرلەنوێ لەسەر پێیەکانی خۆی وەستایەوە, چونکە پێشووتر لەسەر سەر ڕاوەستابوو. شتێك کە شایانی باسە ئەوەیە, ئەوە تەنها ئێمە نین کە ئەم دیالێکتیکی

ماتریالیستییەمان, کە ئێستا ئیتر ساڵانێکی دوورودرێژە باشترین هۆی کارکردنمان و بڕندەترین چەکی دەستمانە, دۆزیوەتەوە, بەڵکو بە جیا لە ئێمە و تەنانەت بە جیا لە هیگڵیش, کرێکارێکی ئەڵمانی بە ناوی یوسف دیتسگن[17], ئەمەی دۆزیوەتەوە.

بەم شێوەیە لایەنە شۆڕشگێڕانەکەی فەلسەفەی هیگڵی, زیندوو بووەوە و لە هەمان کاتدا لەو بەرگە ئایدیالیستییەی کە لە جێبەجێبوونی هاوئاهەنگی ئەوانە, لە فەلسەفەی هیگڵیدا, کۆسپی پێکئەهێنا, ڕزگار کرا. بیرۆکەی مەزنی بنەڕەتیی کە دەڵێت, جیهان لە شتگەلی ئامادە و تەواکراو پێکنەهاتووە, بەڵکوو کۆمەڵێك پرۆسەیە, کە شتەکان تیایدا بە وەستاوی دێنە پێش چاو, هەروەها وێنای ئەوانە کە بەرهەمی مێشکن, واتە چەمکەکان, لە گۆڕانی بەردەوام دان و دەمێك سەرهەڵئەدەن و دەمێکی دی لە بەین دەچن و لەم نێوەدا پەرەسەندن, سەرباری هەر ڕێکەوتێکی بە ڕووکەش و هەر پاشەکشەیەکی کاتیی, سەرئەنجام ڕێگە بۆ خۆی ئەکاتەوە_ ئەم بیرۆکە مەزنە بنەڕەتییە لە سەردەمی هیگڵەوە تا ڕادەیەك لە هوشیاری گشتیدا جێگیر بووە, بە جۆرێك کە زەحمەتە کەسێك بتوانێت لە شێوە گشتییەکەیدا نکۆڵی لێ بکات. بەڵام دانپێدانان بە قسە شتێکە و جێبەجێکردنی بۆ هەر بارێك بە جیاکار و لە هەر بەشێك لە بەشەکانی توێژینەوە شتێکی ترە. ئەگەر ئێمە لە توێژینەوەکانماندا هەمیشە پەیڕەویمان لەم خاڵە کرد, ئەوا ئیتر چاوەڕوانیکردن بۆ دۆزینەوەی چارەسەری یەکجاری و حەقیقەتی هەتاهەتایی, یەکجار و بۆ هەمیشە ئەسڕینەوە, ئێمە هەرگیز

[17] بڕوانە "جەوهەری کاری فیکریی مرۆیی هەروەکوو نوێنەرێکی کاری جەستەیی ئەی خاتە ڕوو" هامبورگ, چاپی میسنەر. (تێبینی ئەنگڵس).



ئەوەمان لە یاد نەچێت, کە تەواوی ئەو زانیارییانەی بەدەستمان هێناوون, بە ناچاری سنوورداره و بەو هەلومەرجەوە پەیوەستە کە زانیارییەکەمان لێیەوە چنگ کەوتووە. لە هەمان کاتدا ئیتر ڕێزی لە ڕادەبەدەری ناکۆکییەکانی وەکوو ناکۆکی نێوان ڕاستی و هەڵە, چاکە و خراپە, لێك چوو و لێك جیاواز, پێویستی و ڕێکەوت, یانی ناکۆکیگەلێك کە بۆ میتافیزیك, کۆن, بەڵام هێشتا لە ڕادەبەدەر بڵاو, سەخت بوو, ناتوانن کاریگەرییان لەسەر دەروونی ئێمە هەبێت. ئێمە ئەزانین کە ئەم ناکۆکییانە تەنها بەهایەکی ڕێژەییان هەیە: واتە ئەوەی کە ئێستا بە ڕاستی دەژمێردرێت, لایەنی هەڵەی تێدایە, کە ئێستا شاراوەیە, بەڵام لەگەڵ ڕۆژگار خۆی دەرئەخا, ڕێك بە هەمان شێوە ئەوەی کە ئەمڕۆ بە هەڵە ناوزەد ئەکرێ, لایەنی ڕاستیی تێدایە کە بە هۆی ئەوەوە ئەکرا پێشووتر بە ڕاست دابنرایە, ئەوەی کە بە پێویست ناوزەد کراوە, لە ڕێکەوتی پەتی پێکهاتووە و ئەوەی کە بە ڕێکەوت دەژمێردرێت فۆرمێکە پێویستیی, خۆی لە ژێریدا حەشارداوە...هتد.

شێوازی کۆنی توێژینەوە و بیرکردنەوە کە هیگڵ بە "میتافیزیکی" ناوی ئەبات, کە شتەکان زیاتر بە ناونیشانی چتگەلی تەواو و لە گۆڕاننەهاتوو لەبەرچاوئەگرێت, کە هێشتا پاشماوەکەی لە هزردا بنج پتەوە, لە سەردەمی خۆیدا پاساوێکی دیرۆکیی گەورەی هەبووە. پێویستە سەرەتا لە شتەکان بتۆژرێنەوە تا بکرێت هەنگاو بۆ توێژینەوەی پرۆسەکان هەڵبهێنرێتەوە. پێویستە یەکەم جار ماهییەتی ئەم یان ئەو شتە دیاریکراوە بزانرێت, تا بکارێیت لەو گۆڕانانەی کە بەسەریاندا دێن بکۆڵیتەوە. بارەکە بۆ زانستە سرووشتییەکان کتومت بەم جۆرە بوو. میتافیزیکی کۆن کە پێی





وابوو پێكهاتەی شتەكان بە سەرئەنجامی خۆیان گەیبیشتوون, لە سرووشتناسییەوە نەشونمای كرد, كە لە شتە گیاندار و بێ گیانەكانی سرووشتی, وا دەكۆڵییەوە, وەك ئەوەی شتگەلێكن, پێكهاتەیان بە سەرئەنجامی خۆیان گەیبیشتوون. بەڵام كاتێك پانتایی توێژینەوەكان لە شتگەلی دابڕاو لەیەك گەیبیشتە ئاستێك كە هەڵهێنانەوەی هەنگاوی یەكلاكەرەوەی تازە بەرەو پێش لە تواناداببێت, واتە دەستدانە توێژینەوەی سیستماتیكی ئەو گۆڕانانەی كە لە خودی سرووشتدا بەسەر ئەو شتانەدا دێت, ئەو دەمە لە مەیدانی فەلسەفەشدا, زەنگی مەرگی میتافیزیكی كۆن لێ ئەدرێت. لە ڕاستیدا ئەگەر تا كۆتایی سەدەی ڕابردوو سرووشتناسی, زیاتر زانستی كەڵەكە (تراكم), زانستی ئەو شتانەی كە پێكهاتنیان بە سەرئەنجام گەیبیشتووە, بوو, ئەوا ئیتر لەم سەدەیەی ئێمەدا بووە بە زانستی پۆلێنكردن, زانستی پرۆسەكان, زانستی پەیدابوون و پەرەئەستاندنی شتەكان و ئەو پەیوەندییانەی كە ئەم پرۆسە سرووشتیانە لە یەكەیەكی گەورەدا كۆ ئەكاتەوە. فیزیۆلۆژی كە لەو كارلێكانەی لە ئۆرگانیزمی ڕووەك و گیانەوەردا هەن دەكۆڵێتەوە, كۆرپەلەناسی كە لە پەرەسەندنی هەر ئۆرگانێك لە كۆرپەییەوە تا پێئەگات دەكۆڵێتەوە, زەمینناسی كە لە پێكهاتنی بەرەبەرەی توێكڵی زەوی دەكۆڵێتەوە, _ تێكڕای ئەم زانستانە لە نەوەكانی ئەم چەرخەی ئێمەن.

زانستی پەیوەندی پرۆسە (كارلێك, تفاعل) كان كە لە سرووشتدا ڕووئەدەن, بەهۆی سێ دۆزینەوەی مەزنەوە بە تایبەت, هەنگاوی مەزنی بەرەو پێش نا:





یەكەم, دۆزینەوەی سێڵ (خانە) بەو پێناسەیەی, ئەو یەكەیەی كە لە ئەنجامی زۆربوون و دابەشبوونەوە تەواوی پەیكەری ڕووەك و گیاندار گەشە ئەكات. ئەم دۆزینەوەیە نەك تەنها هەر ئێمەی گەیاندە ئەو بڕوایەی كە پەرەسەندن و نەشونمای گشت ئۆرگانیزمە باڵاكان بەپێی یەك ڕێسای گشتی ڕووئەدەن, بەڵكوو بە نیشاندانی ئامادەیی سێڵەكان بۆ گۆڕان, ئەو ڕێگایەشی دەستنیشان كرد كە لە ئۆرگانیزمەكاندا ئەبێتە هۆی گۆڕانی چەندایەتی و سەرئەنجام ئەو ئۆرگانیزمانە ئەتوانن پرۆسەی پەرەسەندن كە شتێكی زیاترە لە پەرەسەندنی فەردی ڕووت, تەی بكەن.

دووەم, دۆزینەوەی گۆڕانی وزە (ئینێرژی) كە نیشانی دا, هەموو ئەوانەی پێیان دەووترێت هێزەكان, كە پێش هەر شتێك لە سرووشتی نا ئۆرگانیكدا كاری خۆیان ئەكەن_ هێزی میكانیكی و تەواوكەرەكەی كە بە ماتەوزە نێودەبرێت, گەرما, تیشك (ڕوناكی, resp[18] گەرمای تیشكدەر), كارەبا, موگناتیس, وزەی كیمیاوی_ ئەوانە شێوەی جۆراوجۆری دەركەوتنی بزووتنەوەی گشتین, كە لە هاوسەنگییەكی چەندایەتی دیاریكراودا بۆ یەكتری دەگۆڕێن, بە جۆرێك كە هەركاتێك بڕێك لە یەكێكیاندا دیار نەمێنێ, لە بری ئەوە بڕێكی دیاریكراو لە یەكێكی تر دەرئەكەوێ, بەو جۆرە هەموو بزووتنەوەیەك لە سرووشتدا لە چوارچێوەی پرۆسەیەكی لێك بەستراو لەگەڵ یەكتر, لە شێوەیەكەوە بۆ یەكێكی تر ئەگۆڕێت.

لە كۆتایی, سێیەم, ئەو سەلماندنە لۆژیكییەی كە بۆ یەكەمین جار لە لایەن داروینەوە خرایە ڕوو كە دەڵێت, هەموو ئەو ئۆرگانیزمانەی كە

[18] واتە: respective. (و. عەرەبی).

هەنووکە دەوروبەرمانیان گرتووە, لە نێویشیاندا مرۆڤ, لە ئەنجامی پرۆسەیەکی دوورودرێژی پەرەسەندنی ژمارەیەکی بچوکی ناووکی لە بنەڕەت تاك خانەیی, کە خودی ئەم ناووکە بە نۆرەی خۆی لە پرۆتۆپلازم یان سپێنە, کە بە ڕێگەی کیمیایی پەیدابووە, پێکهاتووە.

بەهۆی ئەم سێ دۆزینەوە گەورەیە و بەهۆی سەرکەوتنە گەورەکانی تری سرووشتناسییەوە, ئەمڕۆ ئێمە ئیتر دەتوانین, نەك تەنها هەر پەیوەندی نێوان پرۆسەکانی سرووشت لە مەیدانە جۆراوجۆرەکاندا کە هەن بدۆزینەوە, بەڵکوو دەتوانین بە شێوەیەکی گشتی, ئەو پەیوەندییەی کە ئەم مەیدانە هەمە جۆرانەش لێك دەبەستێت, بدۆزینەوە. بەم چەشنە, بە کۆمەکی ئەو زانیارییانەی کە خودی سرووشتناسی ئەزمونگەری بەدەستی هێناوە, دەتوانرێت بە شێوەیەکی تا ڕادەیەك سیستماتیك, تابلۆیەکی گشتیی سرووشت بەو پێیەی کە یەکەیەکی تێهەڵکێشە, پیشان بدرێت. خستنەڕووی تابلۆیەکی گشتیی سرووشتی لەم چەشنە لە ڕابردوودا, ئەرکی ئەو بەشە بوو کە پێی دەگوترا فەلسەفەی سرووشت, کە لە توانایدا نەبوو بە کارێکی وا هەستێت, مەگەر لە بری پەیوەندییە واقیعییەکانی نێوان دیاردەکان کە هێشتا لە لای ڕۆشن نەبوو, پەیوەندییە ئایدیاڵ و خەیاڵییەکان دابنێت, دانانی خەیاڵەکان لە شوێنی واقیعەکان, بۆشاییە واقیعییەکان تەنها بە وێناکان پڕ دەبنەوە. کاتێك ئەمەی کرد, بیرۆکەی بلیمەتانەی زۆروزەبەندی گوت, پێشبینی زۆری بۆ دۆزینەوەکان کە دواتر هاتنەدی, کرد, بەڵام لە هەمان کاتدا شتە پڕوپوچەکانیشی کەم نەبوون. لەو دەمەدا جگە لەمە شتێکی دی لە توانادا نەبوو. بەڵام هەنووکە ئەوە بەسە, کە بە تێڕوانینێکی دیالێکتیکییانە, واتە لە ڕوانگەی پەیوەندی تایبەتی نێوان ئەم بەرئەنجامانەوە, بڕوانینە بەرئەنجامەکانی توێژینەوەی سرووشت, بۆ ئەوەی



"سیستەمی سرووشت" بە جۆرێك دابنێین کە وەڵامگۆی سەردەمەکەمان بێت و درکی خەسڵەتی دیالێکتیکی ئەم پەیوەندییە تەنانەت لە مێشکی ئەو توێژەرانەی سرووشت کە, بەدەر لە ویستی خۆیان, بە ڕێگایەکی میتافیزیکییانە پەروەردە کراوون, بچەسپێت_ ئەمڕۆکە ئیدی, دەورانی کۆتایی فەلسەفەی سرووشت هات. هەرجۆرە کۆششێك بۆ زیندووکردنەوەی نەك هەر زیادەیە, بەڵکوو هەنگاوێکیشە بەرەو دوا.

بەڵام ئەوەی کە بەسەر سرووشتدا, کە ئێستا ئێمە بە وێنەی پرۆسەی مێژوویی پەرەسەندن درکی ئەکەین, جێبەجێ ئەبێت, بەسەر هەموو بەشەکانی مێژووی کۆمەڵیش, هەروەها بەسەر تێکڕای ئەو زانستانەی کە لە مەسەلە مرۆڤایەتی (خودایی)یەکان دەکۆڵنەوە, جێبەجێ دەبێت. فەلسەفەی مێژوو, ماف و ئایین...هتد. هەروەکوو فەلسەفەی سرووشت, بریتی بوون لەوەی کە پەیوەندی ساختەی دروستکراوی فەیلەسوفەکان, جێگەی پەیوەندی واقیعی گرتبۆوە, کە پێویستە لە ڕەوتی ڕووداوەکانەوە بدۆزرێتەوە و بریتی بوون لەوەی کە, مێژوو__ بە گشت و بە بەشە لێکجیاکانییەوە _ جێبەجێبوونی بەرەبەرە و بەردەوامی ئایدیاکان بوو, هەڵبەتە تەنها ئایدیا پەسەندکراوەکانی لای هەر فەیلەسوفێکی دیاریکراو. لەم ڕوانگەیەوە بەو بەرئەنجامە ئەگەیت کە, مێژوو بە شێوەیەکی نا ئاگایانە بەڵام بە ناچاریی, لە پێناوی بەدیهاتنی ئامانجێکی ئایدیالی دیاریکراو, کە پێشتر بڕیاری لەسەر دراوە, کار ئەکات, بۆ نموونە, ئەم ئامانجە بە لای هیگڵەوە, بەدیهێنانی بیرۆکە ڕەهاکەیەتی, کە پێی وایە, هەوڵی هەمیشەیی بەرەو ئەم ئایدیا ڕەهایە, پەیوەندی دەروونی ڕووداوە مێژووییەکان پێکئەهێنێ. بەم جۆرە لە شوێن پەیوەندیی واقیعی کە هێشتا ڕۆشن نەبوو,





زاتێك (خودا)ی نوێ, پەنهانی و ناهوشیار, یان وردەوردە بە هوشیاریی ئەگات, قەرار ئەگرێت. پاشان لێرەشدا, ڕێك بەو جۆرەی کە لە مەیدانی سرووشت ڕووی دا, پێویستە ئەم پەیوەندییە ساختە و دروستکراوانە بخرێنە لاوە, تاوەکوو پەیوەندییە واقیعییەکان بدۆزرێنەوە. سەرئەنجام, ئەم ئەرکە بە دۆزینەوەی ئەو یاسا گشتییانەی بزووتنەوەوە پەیوەستە کە لە مێژووی کۆمەڵگای مرۆییدا بە وێنەی یاسای زاڵ کاری خۆیان کردووە.

بەڵام مێژووی پەرەسەندنی کۆمەڵ, لە یەك خاڵدا, لەگەڵ مێژووی پەرەسەندنی سرووشت, جیاوازی بنەڕەتی هەیە. ئەو جیاوازییەش ئەوەیە کە لە سرووشت (بەو ڕادەیەی کە ئێمە کاردانەوەی مرۆڤ لەسەری بخەینە لاوە)دا, تەنها هێزە کوێر و نا ئاگاکان کار لە یەکتری ئەکەن و لە میانەی کاریگەرییەکانیانەوە لە سەر یەکتر, یاسا گشتییەکان پەیدا ئەبن. لێرەدا هیچ ئامانجێکی هوشیارانە و خوازراو لە ئارادا نییە: نە لە ڕێکەوتە ڕووکەشە بێشومارەکان و لە ڕوودا بینراو, نە لەو دوا بەرئەنجامانەی کە جەخت لەسەر هەبوونی نەزمێکی قانونمەندانە لە دەروونی ئەو ڕێکەوتانە ئەکەنەوە. بەڵام لە مێژووی کۆمەڵدا مەسەلەکە بە پێچەوانەوەیە, لە مێژووی کۆمەڵدا, ئەو مرۆڤانەی کە بەهرەی هوشیارییان هەیە چالاکی دەنوێنن و بە هۆی بیرکردنەوە, یان بە کاریگەری سۆز, کار ئەکەن و ئامانجێکی دیاریکراو لەبەرچاوئەگرن. لێرەدا هیچ کارێك بە بێ نیازێکی وشیارانە و بە بێ ئامانجێکی داواکراو بە ئەنجام ناگات. بەڵام مەترسی ئەم جیاوازییە بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوویی_ بە تایبەت بۆ لێکۆڵینەوەی سەردەم و ڕووداوە جیاوازەکان_ بە هەر ئەندازەیەك بێت, هێشتا بە هیچ کلۆجێك شتێك لەو ڕاستییە ناگۆڕێت کە ڕەوتی مێژوو پابەندی یاسای گشتیی دەروونییە. لە ڕاستیدا ڕێکەوت, بە شێوەیەکی گشتی و وەك دێتە دیتن, لەم مەیدانەشدا و



لە ئاستی دیاردەکان, سەرباری ئەو ئامانجانەی کە ئاگایانە خواستی هەموو تاکێکە هەریەکە بە جودا, فەرمانڕەوایە. ئەوەی خوازیارین, لە هەندێك حاڵەتی کەمدا نەبێت, نایەتەدی, بەڵام ئەو ئامانجانەی کە خەڵکی لە بەردەم خۆیانیان داناوە, زۆر کات توشی بەیەکدادان و ناکۆکی دێن, یان مرۆڤ دستی پێیان ڕاناگات, بەشێکی بەهۆی خودی ماهییەتی خۆیەوە, بەشێکی تریشی بەهۆی ناتەواوی هۆیەکانی جێبەجێکردنەوە. بەیەکدادانی کۆششە بێشومارە جودا (منفرد)کان و کردارە بێشومارە جوداکان لە مەیدانی مێژوودا, ئەبێتە هۆی هێنانەکایەوەی هەلومەرجێك کە بە تەواویی هاوشێوەی ئەو هەلومەرجە زاڵەیە کە بێئاگایانە لە سرووشتدا فەرمانڕەوایە. کردارەکان خاوەن ئامانجێکی تا ڕادەیەك خوازراون, بەڵام بەرئەنجامێك کە لەو کردارانە ئەکەونەوە, بە تەواویی نەخوازراون. ئەگەر ئەم بەرئەنجامانە لە سەرەتادا وا دەربکەون, کە لەگەڵ ئامانجە خوازراوەکەدا جووت دێنەوە, بەڵام لە دواییندا هەڵگری شتێکە کە لە شتە خوازراوەکەوە دوورە. بەو جۆرە بەو سەرئەنجامە ئەگات کە, ڕێکەوت لە مەیدانی دیاردەکانی مێژووشدا تێکڕا و بە هەمان شێوە, فەرمانڕەوایە. بەڵام لە هەر شوێنێك گەمەی ڕێکەوت کەوتە ڕوو, ئەوا هەمیشە خودی ئەو ڕێکەوتە لەوێدا, ملکەچی یاسای دەروونی و نهێنییە. گشت مەسەلەکەش بە تەنها, دۆزینەوەی ئەم یاسایانەیە.

ڕەوتی مێژوو هەرچۆنێك بێت, خەڵکی بەم جۆرە دروستی ئەکەن: هەر کەسێك پەیڕەوی لەو ئامانجانە ئەکات, کە بە هوشیارییەوە لەبەردەم خۆی دایناوە, سەرئەنجامی گشتی ئەم هەموو کۆششانەی کە بە ئاراستەی جیاواز کار ئەکەن و کاریگەرییە جۆراوجۆرەکانیان لە جیهانی دەرەکیدا, ئەوا مێژوو ڕێك ئەوەیە. بەم پێیە, مەسەلەکە لەو چوارچێوەیەدا دەمێنێتەوە کە





ئەم ژمارە فراوانە لە خەڵكی جودا, خوازیاری چین. سۆز یان بیركردنەوە ئیرادە دیاری ئەكات. بەڵام ئەو پاڵنەرانەی كە بە نۆبەی خۆیان ڕاستەوخۆ سۆز و بیركردنەوە دیاری ئەكەن, گەلێك لایەنی جۆراوجۆری هەن. ئەشێ سەروەختێك شتگەلی دەرەكی بن, سەروەختێكی تر پاڵنەرە ئایدیاڵەكان: ناوبانگخوازی, "خزمەتكردنی ڕاستیی و ڕەوایی", كینەی شەخسی و تەنانەت جۆرەها ئارەزووی (هەوەس) كەسێتیی ڕووت. بەڵام لە لایەكەوە, ئەو كۆششە فراوانە جودایانانەمان بینی كە لە مێژوودا كار ئەكەن و زۆر وەخت بەو ئەنجامەی كە لە بەردەم خۆیانیان داناوە, نەگەییشتوون, بەڵكوو زۆرجار بە ئەنجامێكی تەواو پێچەوانە لەوەی كە مەبەستە گەیشتوون, لەبەر ئەوەی ئەم پاڵنەرانەش بۆ سەرئەنجامی كۆتایی, تەنها گرنگیی پلە دوویان هەن.

لە لایەكی ترەوە, مەسەلەیەكی تازە پەیدا ئەبێت: ئەو هێزە بزوێنەرانە كامانەن كە بە نۆبەی خۆیان لە پشتسەری ئەم پاڵنەرانەدا خۆیان حەشارداوە, ئەو هۆكارە مێژووییانە چین كە شێوەی ئەم پاڵنەرانە لە مێشكی خەڵكانی كاركەر بەخۆی دەگرێت؟

ماتریالیزمی كۆن هەرگیز, ئەم پرسیارەی لە خۆی نەكردووە. لەبەر ئەوە ڕوانگەی ئەو بۆ مێژوو_ تا ئەو جێگایەی كە بە شێوەیەكی گشتی خاوەن ڕوانگەیەكی لەو جۆرە بێت_ لە بنچینەدا ڕوانگەیەكی پراگماتیك (pragmatic, عملی)ی بوو: دادوەریی ئەو بۆ هەر شتێك بە پێی پاڵنەری كردارە, پیاوانی مێژوو بە شەرافەتمەند و كەڵەكباز دابەش ئەكات, پێی وایە كە وەك باوە, شەرەفمەندان شكست ئەخۆن و كەڵەكبازانیش سەرئەكەون. لێرەوە بۆخۆی بەو ئەنجامگیرییە ئەگات كە, پەند لە مێژوودا یەكجار كەمە, بەڵام بۆ ئێمە ئەو ئەنجامە دێتە دەست كە ماتریالیزمی كۆن





لە مەیدانی مێژوودا ناپاكی لە خۆی كردووە, چونكە پێی وایە, هێزە پاڵنەرە ئایدیاڵەكان كە لەوێدا كار ئەكەن دوا هۆكاری ڕووداوەكانن, لە جیاتی ئەوەی لەوە بكۆڵێتەوە كە چ شتێك لە پشت ئەوەوە خۆی حەشار داوە و پاڵنەرەكانی ئەم هێزە پاڵنەرانە چین. نەبوونی هاوئاهەنگی ناگەڕێتەوە بۆ داننان بە بوونی هێزە پاڵنەرە ئایدیاڵەكان, بەڵكوو ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە لەوێدا دەوەستێت و دوورتر ناڕوات, تاوەكوو بە هۆكاری بزوێنەری ئەم هێزە پاڵنەرە ئایدیاڵە بگات. بە پێچەوانەوە, فەلسەفەی مێژوو, بە تایبەت لە كەسی هیگڵدا, دان بەوەدا دەنێت كە, پاڵنەری كەسایەتییە مێژووییەكان, چ پاڵنەرە ڕووكەشەكان یان ڕاستەقینەكان, بە هیچ جۆرێك دوا هۆكاری ڕووداوە مێژووییەكان نین و لە پشت ئەم پاڵنەرانەوە هێزی بزوێنەری دیكە خۆیان حەشارداوە, كە پێویستە بە دوویاندا بگەڕێین. بەڵام فەلسەفەی مێژوو لێكۆڵینەوە لەسەر ئەم هێزانە لە خودی مێژوودا ناكات, بەڵكوو بە پێچەوانەوە, لە دەرەوە, لە ئایدیۆلۆژی فەلسەفییەوە ئەیان هێنێت. بۆ نموونە, لە جیاتی شیكردنەوەی مێژووی یۆنانی كۆن بە پێی پەیوەندییە ناوخۆییەكەی, هیگڵ زۆر بە سادەیی ڕای دەگەیەنێت كە, ئەم مێژووە جگە لە دانانی "شێوەكانی تاكێكی قەشەنگ" و بە عەمەلیكردنی یەك " هونەری ناوازە" وەك ئەوەی كە هەیە, شتێكی تر نییە. هیگڵ بەم بۆنەیەوە تێبینیگەلێكی بەرز و قوڵ و فراوان سەبارەت بە یۆنانییە كۆنەكان ئەدات, بەڵام لەم سەردەمەدا شیكردنەوەیەكی لەو چەشنە كە تەنها ڕستەسازییەكی پەتین, ئێمە ڕازی ناكات.

بەم پێیە, كاتێك قسە دێتە سەر توێژینەوە لە سەر ئەو هێزە بزوێنەرانەی كە لە پشت پاڵنەری كەسایەتییە مێژووییەكانەوە وێستاوون (ئیتر ئەوانە بە

ئاگابییەوە بن, وەیان هەروەکوو زۆر کات بینراوە بە ناگایی), بە مانایەکی تر کاتێك قسە دێتە سەر توێژینەوە لە هێزگەلێك کە دەرئەنجام هێزی بزوێنەری واقیعیی مێژوو پێکئەهێنن, نابێت پاڵنەری تاکە جوداکان, تەنانەت ئەگەر چەندەش دەرکەوتبن, بە ڕادەی ئەو پاڵنەرانەی کە جەماوەرێکی زۆری خەڵکی, سەرتاپا گەلێك, لە نێو هەر گەلێکیش بە نۆبەی خۆی, سەرتاپای یەك چین, ئەهێنێتە جوڵە, لەبەرچاو بگیرێن. ئەوەی لێرەدا گرنگە, تەقینەوە کورتماوەکان و چەخماخە هەنووکەییەکان نییە, بەڵکوو ئەو بزووتنەوە درێژخایەنانەیە کە پێویستی ئاڵوگۆڕی مێژوویی گەورە ئەهێننە کایەوە. توێژینەوە لەو هۆکارە بزوێنەرانەی کە بە ڕۆشنیی یان نا ڕۆشن, ڕاستەوخۆ یان بە شێوەی ئیدئۆلۆژیك و تەنانەت خەیاڵی لە مێشکی جەماوەری هەڵسوڕاو و ڕابەرانیدا, ئەوانەی پێیان ئەگوترێت پیاوانی مەزن, وەك پاڵنەری هوشیار, ڕەنگئەداتەوە_ یانی گرتنەبەری ئەو تاکە ڕێگایەی کە بە زانینی ئەو یاسایانە دەگات, کە لە مێژوودا بە گشتی و لە سەردەمە جیاوازەکان و لە وڵاتە جیاوازەکاندا فەرمانڕەوا بوونە. هەموو ئەو شتانەی کە خەڵکی ئەبزوێنێ, بە ناچاری, ئەبێ بە هزریاندا گوزەر بکات. بەڵام ئەوەی کە لەم هزرەدا چ شێوەیەك بە خۆ دەگرێت, ئەوە تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر بە هەلومەرجەکەوە پەیوەستە. ئێستا ئیتر کرێکاران ئامرازەکان تێکناشکێنن, هەر بەو جۆرەی کە لە ساڵی ١٨٤٨ لە ڕاین کردیان. بەڵام ئەمە بە هیچ جۆرێك بەو مانایە نییە, کە ئەوان لە بەکارهێنانی ئامرازەکاندا, بە شێوازی سەرمایەداری, ڕازین.

بەڵام ئەگەر توێژینەوە لە هۆکارە بزوێنەرەکانی مێژوو لە تەواوی قۆناغەکانی ڕابردوو بەهۆی ئەوەی کە پەیوەندییەکانی نێوان ئەم هۆکارانە و بەرئەنجامەکانیان شێواو و شاراوە بوو, لە توانادا نەبوبێت, ئەوا لەم



چەرخەی ئێمەدا ئەم پەیوەندییانە بە ئەندازەیەك سادەبوونەتەوە, کە تەنانەت سەرئەنجام, کردنەوەی هێماکان لە توانادا بێت. لە سەردەمی پەیدابوونی پیشەسازی گەورەوە, یانی لانی کەم لە سەردەمی پەیمانی ساڵی ١٨١٥ ی ئەورووپاوە, لە ئینگلتەرا, بەلای هیچ یەکێکەوە ئەوە شاراوە نەبوو کە, چەقی قورسایی سەرتاپای تێکۆشانی سیاسی لەم وڵاتەدا بریتی بوو, لە هەوڵی دوو چین بۆ گرتنی دەسەڵات: ئەریستۆکراتی زەویدار ( Landed aristocracy) لە لایەك و بۆرژوازی (Middel class) لە لایەکی دی. لە فەرەنسا لە پاش گەڕانەوەی بۆربۆنەکان, هەستیان بە هەمان واقیع کرد. مێژوونووسان لە قۆناغی گەڕانەوە (١٧), لە تیێری هەتا ئەگات بە گیزو و مینیە و تیێر, هەمیشە ئەو واقیعە وەکوو کلیلی تێگەییشتن لە مێژووی فەرەنسا لە سەدەکانی نێوەند بە دواوە, ئاماژە پێ ئەکەن. لە ساڵی ١٨٣٠یەوە لە هەردوو ئەم دوو دەوڵەتەدا, دان بە چینی کرێکار, پرۆلیتاریا, هەوڵدەری سێهەم بۆ گرتنی دەسەڵات, نرا. پەیوەندییەکان بە ڕادەیەك سادە بوونەوە, مەگەر تەنها ئەوانەی بە ئەنقەست چاوی خۆیان ئەنوقان, ئەتوانن ئەوە ببینن کە ململانێی ئەم سێ چینە مەزنە و پێکدادانی بەرژەوەندییەکانیان, هێزی بزوێنەری سەرتاپای مێژووی هاوچەرخ, لانی کەم لەم دوو وڵاتە یانی لە پێشڕەوترین وڵاتان, پێکئەهێنن.

بەڵام ئەم چینانە چۆن پەیدابوون؟ ئەگەر لە یەکەم تێڕوانیندا پەیدابوونی مڵکداری گەورەی زەوی, مڵکدارییەك کە سەردەمانێك فیوداڵی بوو, لانی کەم لە سەرەتای کاردا, بە هۆکاری سیاسی, وەکوو داگیرکردنی بە زەبر و زۆر, لێکئەدرایەوە, ئەوا لێکدانەوەی لەم جۆرە بۆ بۆرژوازی و پرۆلیتاریا ئیتر مەحاڵ بوو. ئەوە لە ڕادەبەدەر ڕۆشنە کە پەیدابوون و پەرەسەندنی ئەم





دوو چینە مەزنە بەرئەنجامی هۆکاری ئابووری بوون بە تەنها. بە هەمان ئەندازە ڕۆشن بوو, کە تێکۆشانی نێوان زەویداری گەورە و بۆرژوازی, ڕێك وەکوو تێکۆشانی نێوان بۆرژوازی و پرۆلیتاریا, لە پێش هەر شتێکەوە, لەسەر بەرژەوەندیی ئابووری بوو, کە دەسەڵاتی سیاسی جگە لەوەی هۆیەك بوو بۆ دابینکردنی ئەم بەرژەوەندییە شتێکی تر نەبوو. بۆرژوازی, بە هەمان شێوە پرۆلیتاریاش, بەهۆی ئاڵوگۆڕ لە پەیوەندییەکانی ئابووری, یان ڕەوانتر بڵێین, بەهۆی ئاڵوگۆڕ لە شێوازی بەرهەمهێناندا, پەیدابوون. سەرەتا گوێزانەوە لە سیستەمی بەرهەمهێنانی پیشەییەوە بۆ مانیفاکتۆرە, پاشان لە مانیفاکتۆرەوە بۆ پیشەسازی گەورە, بۆ بەرهەمهێنان بە هۆی ئامرازگەلێکەوە کە هەڵمی تێدا بەکاربێت, ئەمە بووە مایەی پەرەسەندنی ئەم دوو چینە. لە قۆناغێکی دیاریکراوی پەرەسەندندا, هێزە بەرهەمهێنەرە نوێکان کە بۆرژوازی بەڕێوەی ئەبردن (بە پلەی یەکەم, دابەشکردنی کار و کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆری کرێکارانی پەرشوبڵاو, لە دامەزراوەی هاوبەشی مانیفاکتۆرەدا) و هەلومەرج و پێویستییەکانی گۆڕینەوە کە بە هۆی ئەم هێزانەوە پەرەی سەندووە, لەگەڵ ئەو سیستەمی بەرهەمهێنانەی کە لە ئارادا بووە, کە میراتی مێژووییە و بە یاسا پیرۆز کراوە, ناتەبا بوو, واتە لەگەڵ ئیمتیازەکانی سیستەمی پیشەیی بەرهەمهێنان و لەکەڵ ئیمتیازە زۆروزەبەندەکانی تر, شەخسی و ناوچەیی (کە بۆ ئەو دەستەگەلەی ئیمتیازێکیان نییە, کۆتوبەندێکی زۆری تێدایە) کە بۆ سیستەمی کۆمەڵایەتی فیۆداڵی پێویستە, نا تەبا بوو. هێزە بەرهەمهێنەرەکان لە شەخسی نوێنەرەکەی خۆیاندا واتە بۆرژوازی, لە دژی ئەم سیستەمە بەرهەمهێنانەی کە زەویداران و فیۆداڵەکان و وەستا پیشەییەکان نوێنەرایەتییان ئەکرد, شۆڕشیان کرد. دەرئەنجامی تێکۆشان





ڕۆشنە. کۆتوبەندی فیۆداڵی تێکشکا: لە ئینگلتەرا بە شێنەیی, لە فەرەنسا بە یەك کەڕەت, لە ئەڵمانیا هێشتا لە نێو نەبراوە. بەڵام بە هەمان ئەو شێوەیەی کە مانیفاکتۆرە لە قۆناغێکی پەرەسەندنی خۆیدا لەگەڵ سیستەمی بەرهەمهێنانی فیۆداڵیدا بەیەکیاندا دا, ئەمڕۆ ئیتر پیشەسازی گەورە لەگەڵ سیستەمی بۆرژواییدا, کە جێنشینی سیستەمی فیۆداڵییە, کەوتۆتە ململانێ و پێکدادان. ئەم پیشەسازییەی کە وابەستەی ئەم سیستەمەیە و لە چوارچێوەی تەنگی شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریدا قەراری گرتووە, لە لایەکەوە ئەبێتە هۆی بە پرۆلیتاریزەکردنی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر و بێ پسانەوەی جەماوەری مەزنی خەڵك, لە لایەکی ترەوە بڕێکی بەرهەم کە بەردەوام لە زیادبووندایە و بازاڕی فرۆشی نییە, بەرهەم ئەهێنێ. زێدەبەرهەم و هەژاریی جەماوەریی_کە هۆکاری یەکترین_, ئەوەیە, ئەو ناکۆکییە پوچەی کە پیشەسازی گەورە تووشی ئەبێت و بە ناچاریی ئەبێ لە ڕێگای گۆڕینی شێوازی بەرهەمهێنانەوە, هێزە بەرهەمهێنەرەکان لەو کۆتوبەندە ڕزگار بکرێن.

بەم شێوەیە, لانی کەم بۆ مێژووی هاوچەرخ ئەوە جێگیر بوو کە, هەر تێکۆشانێکی سیاسی تێکۆشانی چینایەتییە و هەر تێکۆشانێك لە لایەن چینەکانەوە بۆ ڕزگاری خۆیان بە بێ لەبەرچاوگرتنی شێوەکەی کە بە ناچار سیاسییە (چونکە هەموو تێکۆشانێکی چینایەتی, تێکۆشانی سیاسییە) سەرئەنجام تێکۆشانە لە پێناو ڕزگاریی ئابووری. کەواتە گومانێك لەوەدا نییە, لانی کەم لە مێژووی هاوچەرخدا کە دەوڵەت و سیستەمی سیاسی توخمی دووەم, بەڵام کۆمەڵگای مەدەنی کە مەیدانی پەیوەندییەکانی ئابوورییە, توخمی بڕێنەرەوە پێکئەهێنن. بە پێی تێگەیشتنی کۆن

سەبارەت بە دەوڵەت, کە هیگڵیش تیایدا بەشدار بوو, دەوڵەت بە پێچەوانەوە, توخمی بڕیاردەر و کۆمەڵگای مەدەنی توخمی بڕیارلەسەردراو بوو. ڕواڵەتی کارەکەش لەگەڵ ئەم تێڕوانینە جووت دێتەوە. هەروەکوو چۆن فەردێك, بۆ ئەوەی دەستبەکارێك بکات, پێویستە هەموو ئەو هێزە پاڵنەرانەی کە وای لێ دەکات بەو کارە هەستێت بە مێشکیدا تێپەڕێت و بە پاڵنەری ئیرادەی ئەو فەردە بگۆڕێت, بە هەمان شێوە بێگومان, هەموو پێویستییەکانی کۆمەڵگای مەدەنیش_ بە بێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی لەو ساتە دیاریکراوەدا, کام چینە دەسەڵاتدارە_ بە ناچار, بە ئیرادەی دەوڵەتدا تێئەپەڕن, تاوەکوو لە بەرگی یاسادا گرنگییەکی ئیلزامیی, بۆ هەموان, پیشان بدات. ئەمە لایەنی ڕووکەشی مەسەلەکەیە کە خۆی بۆخۆی بەڵگەنەویستە. بەڵام ئامانجەکە, زانینی ناوەڕۆکی ئەم ئیرادە ڕووکەشییە ڕووتەیە_ ئیتر ئەوە ئیرادەی کەسە جوداکان, یان ئیرادەی دەوڵەت, بێت,_ و زانینی ئەوەی کە ئەم ناوەڕۆکە لە کوێیەوە هاتووە, بۆچی ئەم شتەیان گەرەکە و ئەوی تر نا؟ ئێمە لە میانەی گەڕان بە دوای وەڵامی ئەم پرسیارەدا بەوە دەگەین, لە مێژووی هاوچەرخدا, ئەو فاکتەرەی کە ئیرادەی دەوڵەت دیاری ئەکات تێکڕا, پێویستییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی کە لە گۆڕاندایە و دەسەڵاتداریی ئەم چینە یان ئەوی دیکە, سەرئەنجام, پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنان و پەیوەندییەکانی گۆڕینەوەیە.

بەڵام ئەگەر دەوڵەت تەنانەت لەم چەرخەی ئێمەشدا, بە هۆیە بەهێزەکانی بەرهەمهێنان و هۆیە قەبەکانی گەیاندنەوە, مەیدانێکی سەربەخۆ نەبووبێت و بە شێوەیەکی سەربەخۆ پەرەی نەسەندبێت, بەڵکوو بوون و پەرەسەندنی, سەرئەنجام, بە هەلومەرجی ئابوری زیندەگی کۆمەڵایەتییەوە پەیوەست بێت, ئەوا ئەم مەسەلەیە بۆ هەموو سەردەمەکانی ڕابردووش, یانی



سەردەمێك کە هێشتا بە فراوانی هۆیەکانی بەرهەمهێنان بۆ بەرهەمهێنانی زیندەگی مادی خەڵك لە ئارادا نییە و بەم پێیە, پێویستییەکانی ئەم بەرهەمهێنانە وا دەکات کە, حوکمڕانییەکی زیاتر بەسەر خەڵکەوە بکرێت, هەر دروستە. ئەگەر دەوڵەت تەنانەت هەتا ئەمڕۆش, یانی لە ڕۆژگاری پیشەسازی گەورە و هێڵی ئاسندا, بێجگە لە گوزارشتێکی چڕوپڕی پێویستییە ئابورییەکانی چینی دەسەڵاتدار لە بەرهەمهێناندا, شتێکی تر نەبێت, ئەوا ئەو ڕۆڵەی کە هەیەتی, بۆ ڕۆژگارێك کە هەر نەوەیەك لە خەڵك ئەبوو بەشێکی گەلێك زیاتر لەوەی کە بۆ زیندەگی خۆی دایناوە, بۆ پڕکردنەوەی پێویستییە مادییەکانی تەرخان بکات و وابەستەییەکەی ئەو بۆی, زیاترە لەوەی ئێمە ئەمڕۆ پێوەی وابەستەین, ناچاری (حەتمیەت)یەکی زیاتری هەیە. توێژینەوە لە چەرخەکانی ڕابردوو, لەو کاتەوەی کە ئەم ڕووەی مەسەلەکەمان بە بایەخێکی جیدییەوە وەرگرتووە, بە شێوەیەکی باوەڕپێکراوتر جەخت لەسەر دروستی ئەوەی کە گوتمان ئەکاتەوە. بەڵام بێگومان لێرەدا ئێمە ناتوانین بە درێژی بچینە سەر باسی ئەم مەسەلەیە.

ئەگەر دەوڵەت و مافەکانی دەوڵەت, پەیوەندییەکانی ئابوری دیارییان بکات, ئەوا بەڵگەنەویستە کە خودی ئەو پەیوەندییانە مافە مەدەنییەکانیش, کە لە ناوەڕۆکدا ڕۆڵیان بریتین لە, بە ڕەوا پیشاندانی ئەو پەیوەندییە ئابورییانەی کە لە نێوان تاکەکاندا دروست ئەبن, کە لە هەلومەرجێکی دیاریکراودا, پەیوەندگەلێکی سروشتین, دیاری ئەکات. بەڵام شێوەی ئەم ڕەوایی پیشاندانە ئەشێ جۆراوجۆر بێت. ئەشێ, بۆ نموونە, بەشێکی زۆری شێوەگەلی مافەکانی کۆنی فیۆدالی بهێڵێتەوە, ئەویش بەوەی ناوەڕۆکێکی بۆرژوایییان پێ ببەخشێت, تەنانەت هەر بەو جۆرەی کە





لە ئینگلتەرە ڕووی دا, بە گونجاندن لەگەڵ تێکڕای ڕەوەندی پەرەسەندنی میللیدا, ڕاستەوخۆ ناوەڕۆکە بۆرژواییەکە لە ژێر ناوی فیۆداڵیدا بشارێتەوە. بەڵام ئەکرێ هەر بەو شێوەیەی کە لە ڕۆژئاوای کیشوەری ئەوروپادا ڕوویدا, ڕەفتار بکرێت. واتە, یەکەمین یاسای جیهانی بۆ کۆمەڵگای بەرهەمهێنەرانی کاڵا, یانی یاسای ڕۆمانی, کە بەوپەڕی وردەکارییەوە تەواوی پەیوەندییە حقوقییە بنەڕەتییەکان کە لە نێوان کاڵادارانی سادە (کڕیار و فرۆشیار, قەرزار و خاوەن قەرز, گرێبەست و پەیماننامە و هتد.)دا هەیە, داناوە, بکرێتە پایە. ئەکرێ لەوێدا, بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی کۆمەڵگایەکی وردەبۆرژوازی کە هێشتا نیوە فیۆداڵیشە_ یان ئەم یاسایانە بە شێوەیەکی سادە, بە هۆی پراتیکی دادوەرییەوە (یاسای گشتی ئەڵمانیا), تا ئاستی کۆمەڵگایەکی لەو جۆرە بهێنرێنە خوارەوە, وەیان بە کۆمەکی مافناسانێك کە دەم لە ڕەوشت ئەکوتن, ئەم یاسایانە چاك بکرێن و بە کۆمەڵە یاسایەکی تایبەت بگۆڕدرێن کە لەگەڵ پەرەسەندنی ئەو کۆمەڵگایەی قسەی لەسەر ئەکەین بگونجێن, کۆمەڵە یاسایەك کە لەم هەلومەرجەدا, لەباری مافناسیشەوە خراپە (یاسا ناوچەییەکانی پروس). سەرئەنجام لە دوای شۆڕشی گەورەی بۆرژوازییەوە, لەسەر بنچینەی هەمان ئەم یاسا ڕۆمانییەوە ئەکرێت, کۆمەڵە یاسایەکی کلاسیکی بۆ کۆمەڵگای بۆرژوازی, وەکوو یاسای Code civil (یاسای مەدەنی) فەرەنسی دابنرێن. بەم پێیە, ئەگەر بڕیارەکانی یاسای مەدەنی بە بەرگی مافناسییەوە, گوزارشت لە هەلومەرجەکانی ئابوری ژیانی کۆمەڵایەتی بکەن, ئەوا بە پێی هەلومەرج, جارێك باش و جارێك خراپ گوزارشتی لێ ئەکەن.



یەکەمین هێزی فیکری زاڵ بەسەر مرۆڤدا, لە بوونی دەوڵەتدا خۆی ئەنوێنێ. کۆمەڵگا, بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی خۆی لە پەلامارە ناوخۆیی و دەرەکییەکان, دەزگایەك پێکئەهێنێ, ئەو دەزگایەش, دەسەڵاتدارێتی دەوڵەتە. هەرکە دەوڵەت پەیدابوو, ئیتر لە کۆمەڵگا خۆی جیا ئەکاتەوە و هەرچی زیاتر خۆی بە دەزگای چینێکی دیاریکراو بگۆڕێت و هەرچی زیاتر دەسەڵاتدارێتی ئەو چینە ڕاستەوخۆتر پراکتیزە بکات, بەو ئەندازەیەش سەرکەوتن, لەم ڕووەوە, بەدەستئەهێنێ. خەباتی چینی چەوساوە لە دژی چینی دەسەڵاتدار, بە ناچاری بە خەباتێکی سیاسی یانی بە خەباتێك, کە پێش هەر شتێك لە دژی دەسەڵاتی سیاسی ئەم چینەیە, ئەگۆڕێت. درککردنی پەیوەندی ئەم خەباتە سیاسییە لەگەڵ پایە ئابوورییەکەیدا, ڕوو لە کزی ئەکات و هەندێك جار هەر نامێنێ. بەڵام ئەگەر لە لای خەباتکاران بە تەواوەتی لەنێونەچووبێت, ئەوا لە لای مێژوونووسان زۆر کات هەر نییە. لە نێو ئەو مێژوونووسە کۆنانەی کە باسی خەباتی نێوجەرگەی کۆماری ڕۆمانییان کردووە, ئەوە بە تەنها ئاپیانە کە بە ڕۆشنی بۆمان دەگێڕێتەوە کە سەرئەنجام, ئەم خەباتە لە پێناوی چیدا بووە: لە پێناوی مڵکدارێتی زەوی.

بەڵام هەر کە دەوڵەت لە بەرامبەر کۆمەڵدا, بووە هێزی سەربەخۆ, یەکسەر ئایدیۆلۆژی نوێ ئەهێنێتە کایەوە. واتا, پەیوەندی لەگەڵ ڕووداوە ئابوورییەکان, لە لای سیاسەتمەدارانی پیشەیی و تیۆریسینەکانی یاساکانی دەوڵەت و یاساناسانی یاسای مەدەنی, بە تەواوەتی لەنێوچووە. ڕووداوە ئابوورییەکان, بۆ ئەوەی مۆڵەتی یاسایی بە خۆیانەوە بگرن, بۆ هەر حاڵەتێکی تایبەت ئەبێ, بە شێوەی بابەتگەلی یاسایی دەربکەوون. بێگومان لێرەدا ئەبێ, ڕەچاوی تەواوی ئەو سیستەمە یاساییەی کە لە

ئارادایە بکردرێت. بەهۆی ئەمەوەیە وا دەرئەکەوێت کە, شێوازی یاسایی, هەموو شتێك و ناوەڕۆکی ئابووری, هیچ شتێك نییە. یاسای گشتی (دەوڵەت) و یاسای مەدەنی, وەکوو دوو مەیدانی سەربەخۆ سەیر دەکرێن, کە خاوەن پەرەسەندنی مێژوویی سەربەخۆی خۆیانن و خۆبەخۆ ملکەچی توێژبەندی سیستەماتیکانەن و لە ڕێگای ڕیشەکێشکردنی هەموو ناکۆکییە دەروونییەکانەوە بە شێوەیەکی ڕاوەستاو و پەیگیر, خوازیاری سیستەمبەندییەکی لەم چەشنەن.

ئایدیۆلۆژییە هەرە بڵندەکان, واتە ئەوانەی کە لە بنەمای مادی ئابوری زیاتر دوور ئەکەونەوە, شێوەی فەلسەفە و ئایین لە خۆ دەگرن. لێرەدا, پەیوەندی نێوان بیرۆکەکان و ئەو هەلومەرجە مادییەی کە لە ئارادایە, دەم بە دەم شێواوترئەبێت و لە ئارادابوونی ئەڵقە پەیوەستکارەکانی نێوانیان نارۆشنتر ئەبێت. بەڵام, سەرەڕای ئەوە, ئەم پەیوەندییە هەر هەیە. تێکڕای سەردەمی ڕێنێسانس لە ناوەڕاستی سەدەی پانزەهەمەوە, هەروەها فەلسەفە, کە ئەو دەمە گیانی هاتەوەبەر, لە بنەڕەتدا, دەرئەنجامی پەرەسەندنی شارەکان, واتە بۆرژوازی بوون. فەلسەفە, جگە لەوەی کە بە شێوازی تایبەتی خۆی گوزارشتی لەو بیروباوەڕانە کردووە کە جووت ئەهاتنەوە لەگەڵ گۆڕانی بۆرژوازی بچوك و ناوەڕاست بۆ بۆرژوازی گەورە, شتێکی تری نەکردووە. ئەم مەسەلەیە لە لای ئینگلیزەکان و فەرەنسییەکانی سەدەی ڕابردوو, کە زۆربەیان بە هەمان ئەو ئەندازەیەی کە فەیلەسوف بوون, ئابووریزانیش بوون, بە ڕۆشنی بەرچاوئەکەوێت. ئێمە پێشتر, ئەم مەسەلەیەمان لە پەیوەند بە قوتابخانەی هیگڵەوە, ڕۆشن کردەوە.

ئێستا, با بە خێرایی چاوێك بە ئاییندا بخشێنین, کە لە هەموان زیاتر لە ژیندەگی مادی دوورتر و لە هەموان نامۆ تر دەرئەکەوێ. ئایین لە قۆناغە





زۆر سەرەتاییەکاندا, لە نەزانترین و نارۆشنترین ئەندێشەی تاکەکان سەبارەت بە سروشتی خۆیان و سروشتی دەرەکی کە بە چواردەوریانەوە بووە, پەیدابووە. بەڵام هەر ئایدیۆلۆژیایەك, هەر پاش ئەوەی کە پەیدا ئەبێ, ئیتر لە حاڵی پەیوەندی بە تێکڕای ئەو وێناگەلەوە کە لە ئارادایە, پەرەئەستێنێ و ئاڵوگۆڕی تازەیان بەسەردا ئەهێنێ. ئەگەر نا, ئەوە ئایدیۆلۆژی نەبووە, واتە ڕووبەڕووی بیروباوەڕەکان نابێتەوە, کە بە ناونیشانی ناسنامە سەربەخۆکان و بەشێوەیەکی سەربەخۆ پەرەئەسێنن و تەنها بۆ یاسا تایبەتییەکانی خۆیان سەر دائەنوێنن. بێگومان ئەو ڕاستییە, کە هەلومەرجە مادییەکانی ژیندەگی خەڵك کە پرۆسەی بیرکردنەوە لە مێشکیان ئەخولقێنێ, سەرئەنجام ڕێڕەوی ئەم پرۆسەیە دەسنیشان ئەکات, لە لای ئەم خەڵکە بە ناچاریی, بە هەستپێنەکراوی دەمێنێتەوە, ئەگەر نا, ئەم ئایدیۆلۆژییە کۆتایی پێ دێت. وێنا ئایینییە سەرەتاییەکان, کە لە زۆربەی دۆخەکاندا لە نێو هەر گروپێکی دیاریکراو لەو میللەتانەی خزمی یەکدین, هاوبەشن, لە دوای دابەشبوونی ئەم گروپانە لە هەر میللەتێکدا, بە جیا و بە شێوەیەکی تایبەت, بە پێی ئەو هەلومەرجە تایبەتییەی کە تیایدا ئەژی, پەرەئەستێنێ. پرۆسەی پەرەسەندنی وێنا ئایینییەکان لە لای بەشێك لە گروپەکانی ئەو میللەتانە, بە تایبەت لە لای ئارییەکان (کە پێیان دەڵێن, میللەتە هیندۆ ئەوروپییەکان), لە لایەن میتۆلۆژی بەراوردکارییەوە بە درێژی باسیان لەسەر کراوە. خواوەندەکان, ئەوانەی بەم شێوەیە, لە لای هەر میللەتێك بە جیا, پەیدابوون, خواوەندی میللی بوون و دەسەڵاتیان لە سنووری ئەو سەرزەمینە میللییەیانەی کە ئەم خواوەندانە ئەبێ پارێزگارییان لێ بکەن, تێنەپەڕێت, بەڵام لە لایەکەی تری ئەم سنوورەدا, خواوەندی دیکەی فەرمانڕەوای بێ هاوتان هەن. ئەم خواوەندانە

تێکرا، تا ئەو دەمە لە خەیاڵگەی خەڵکیدا ئەمێننەوە، کە ئەو میللەتەی بەدیهێنەری ئەمانە بوو، لە ئارادابێت و لەگەڵ فەوتانی ئەم میللەتە، ئەویش ئەفەوتیّ. میللەتانی کۆن، بە هۆی جەزرەبەکانی ئیمپراتۆرییەتی جیهانیی ڕۆمەوە، کە ناکرێت لێرەدا لە هەلومەرجە ئابورییەکانی پەیدابوونی بکۆڵینەوە، داڕوخان. خوداوەندە میللییە کۆنەکان سڵوسامیان لە دەست دا، تەنانەت خوداکانی ڕۆمیشی گرتەوە، کە بە پێی ئەڵگۆی بچوکی شاری ڕۆم لە قاڵب درابوون. پێویستییەکانی تەواوکردنی ئیمپراتۆریەتی جیهانیی بە هۆی ئایینێکی جیهانییەوە، لە هەوڵەکانی ڕۆم بۆ پەرستنی تێکڕای خوداوەندە بێگانە ڕێزدارەکان بەم یان بەو ڕادەیە، لە پاڵ پەرستنی خوداوەندە ناوچەییەکان، بە ڕۆشنی خۆی دەرئەخست. بەڵام ناکرێت ئایینێکی نوێی جیهانیی، بە فەرمانی ئیمپراتۆر دابهێنرێ. ئایینی نوێی جیهانیی، واتە مەسیحییەت، بە بیّ هەرا، بە تێکەڵکردنی لاهوتی ڕۆژهەڵاتیی گشتگیر، بە تایبەت یەهودی، لەگەڵ فەلسەفەی باوی یۆنانی، بە تایبەت فەلسەفەی ڕەواقی، پەیدابوو. جا بۆ ئەوەی ئێمە ئەمڕۆ بزانین، کە شێوەی یەکەم جاری مەسیحییەت چۆن بووە، پێویستە توێژینەوەی فراوان ئەنجام بدەین، چونکە ئەوە شێوە فەرمییەکەی مەسیحییە بە ئێمە گەییشتووە، کە کۆڕی ڕۆحانی نیقایی شتیان بۆ زیادکردووە، تاوەکوو بیگونجێنن و بتوانێت ڕۆڵی ئایینی دەوڵەت بگێڕێ (١٩). بە هەر حاڵ، ئەو واقیعەتە، یانی ئەوەی کە ئەم ئایینە لە دوای پەیدابوونییەوە بە دووسەدوپەنجا ساڵ، بە ئایینی دەوڵەت ئەگۆڕێت، بە تەواوەتی نیشانی ئەدات کە، مەسیحییەت وەك ئایینێك، تا چ ڕادەیەك لەگەڵ هەلومەرجی ئەو چەرخەدا خۆی گونجاندبوو. مەسیحییەت لە سەدەکانی نێوەڕاستدا، هاوپای پەرەسەندنی فیۆدالیزم، دیمەنێکی ئایینی وای بەخۆیەوە گرت کە



لەگەڵ فیۆدالیزم و زنجیرە پلەوپایەکانیدا جووت بێتەوە. کاتێکیش کە بۆرژوازی جێگیر بوو، ئاتەئیزمی پرۆتستانتی لە دژی ئایینزای کاتۆلیکی، سەرەتا لە لای ئالبیژییەکان (٢٠) لە باشوری فەرەنسا، لە هەرەتی گەشە و ڕەونەقی شارەکانی ئەوێدا، نەشونمای کرد. سەدەکانی نێوەڕاست، سەرجەم ئایدۆلۆژییەکانی تر، واتە، فەلسەفە، سیاسەت و مافناسی بە لاهوتەوە گرێ دا و کردیانی بە پاشکۆ و بە بەشێك لە لاهووت. دەرئەنجامی ئەم کارە، هەر بزووتنەوەیەکی کۆمەلایەتیی و سیاسی بە ناچاریی، ئەبوو بەرگی ئایین لەبەر بکات. لەبەر ئەوە، بۆ هێنانەکایەوەی بزووتنەوەیەکی بە جۆشی جەماوەریی، کە مێشکیان تەنها بە خۆراکی ئایینی ئاخنراوە، ئەبوایە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی ئەم خەڵکە، لە بەرگێکی ئایینیدا پێشکەش بە خەڵك بکرابایە. بە هەمان شێوەی بۆرژوازی کە هەر لە سەرەتاوە بۆخۆی لایەنگرانێکی لە جۆری خەڵکانی ڕەشۆکی دەستەنگی شارەکان، کرێکارانی کرێگرتە و خزمەتکاران بە هەموو جۆرەکانیەوە_ واتە پێشینانی پرۆلیتاریای ئەمڕۆ_ ئەوانەی کە سەربە هیچ دارودەستەیەك و خاوەن هیچ پلەوپایەیەك نەبوون، دروستکرد، بە هەمان شێوە ئاتەئیستی ئایینیش زۆر زوو، بە دوو جۆر دابەش بوون: ئاتەئیستی بۆرژوازی میانڕەو و ئاتەئیستی ڕەشۆکی شۆڕشگێڕ کە تەنانەت ئاتەئیستە بۆرژواکانیش نەفرەتیان لیّ ئەکردن.

ئەوەی کە وای کرد ئاتەئیستی پرۆتستانتی نەکرێت تێکبشکێنرێ، مەسەلەی لەشکاننەهاتنی بۆرژوازی بوو، کە دەمبەدەم توانا و هێزی زۆرتر ئەبوو. کاتێك کە بۆرژوازی بە ڕادەی پێویست خۆی سەقامگیرکرد، لە دژی خانەدانە فیۆداڵەکان دەستی دایە خەبات، کە تا ئەو دەمە شێوەیەکی ناوخۆیی بە خۆیەوە گرتبوو. ئەو خەباتە ئیتر، بەرەبەرە پێوەرێکی نیشتمانی





به خۆیەوە گرت و سەرجەم خەڵکی گرتەوە. یەکەمین جەنگی مەزن، کە پێی دەگوترا ڕیفۆرم، لە ئەڵمانیا ڕوویدا. بۆرژوازی، هێشتا بەو ڕادەیە بەهێز و پەرەسەندوو نەبوو، کە بتوانێت تەواوی پێکهاتە شۆڕشگێڕەکانی دیکەی وەکوو، خەڵکی ڕەشۆك لە شار، خانەدانە بچووکەکان[19] و جوتیاران لە لادێ، لە ژێر ئاڵای خۆیدا، یەکگرتوو بکات. لە پێش هەموویانەوە، خانەدانەکان شکستیان خوارد، لەو کاتەدا، ڕاپەڕینی جوتیاران، کە ترۆپکی سەراپای ئەم بزووتنەوە شۆڕشگێڕییە پێکئەهێنێ، دەستیپێکرد. بەڵام شارەکان پشتیوانییان لە جوتیاران نەکرد و شۆڕش بە هۆی لەشکری شازادەکانەوە، کە دواتر لە هەموو دەرئەنجامە بە کەڵکەکانی ئەم شۆڕشە سوودمەندبوون، سەرکوت کرا. لەو کاتەوە ئەڵمانیا، بۆماوەی سێ سەدەی ڕەبەق، لە جەرگەی ئەو وڵاتانەی کە بە شێوەیەکی سەربەخۆ و چالاك لە مێژوو کاریان ئەکرد، دائەبڕێت. بەڵام بێجگە لە لۆتەری ئەڵمانی، کالڤینی فەرەنسیش هەبوو. کالڤین، بە تینوتەوژمی ڕەسەنی فەرەنسییانەوە، خەسڵەتی ڕیفۆرمی بۆرژوازی لە پلەی یەکەمدا، دانا و شێوەیەکی کۆماریی و دیموکراسی بە کڵێسا بەخشی. لە کاتێکدا کە ڕیفۆرمی لۆتەری لە نوشوستیدا بوو و وڵاتی بە فەتارەت ئەدا، کۆمارییەکان لە ژنێف، هۆڵەندا و ئۆسکۆتلەندا، ڕیفۆرمی کالڤینییان کردە ئاڵای خۆیان و هۆڵەندا لە دەسەڵاتی ئیسپانیا و ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی ڕزگاری بوو، هەروەها ڕیفۆرمی کالڤینی، پۆشاکی ئایدیۆلۆژی بۆ پەردەی دووەمی شۆڕشی بۆرژوازی کە لە ئینگلتەرە ڕووی دا، سازکرد. کالڤینیزم لێرەدا، وەك دەمامکی واقیعیی ئایینیی، لە پێناو بەرژەوەندییەکانی ئەو ڕۆژگارەی

19 ژێردەست، ناڕازی، پەست و زەبوون. (و. کوردی).



بۆرژوازیدا، خۆی دەرخست، هەر بۆیە نەی توانی، لە دوای شۆڕشی ساڵی ١٦٨٩دا، ڕەزامەندی گشتیی بەدەستبهێنێ، کە بە سازشی نێوان بەشێك لە خانەدانەکان و بۆرژوازی کۆتایی هات. کڵێسای دەوڵەتیی ئینگلیز سەرلەنوێ گەڕایەوە، بەڵام نەك بە شکڵ و شێوە کۆنەکەی، واتە، نەك بە شێوەی کاتۆلیزم لەگەڵ پاشا، کە ڕۆڵی پاپی دەگێڕا، ئێستا ئیتر ئەم کڵێسایە، ڕەنگی کالڤینیزمی بە تۆخی بە خۆیەوە گرت. کڵێسای کۆنی دەوڵەتیی، یەکشەمەی پڕ لە خۆشی و شادی کاتۆلیکی کردە جەژن و یەکشەمەی کالڤینیی وەڕسکەری ڕاوەدوو نا، بەڵام کڵێسای نوێ، کە بە ڕۆحی بۆرژوازی پاراو بوو، بڕیاری لەسەر ئەوەی دواوە دا، کە تا هەنووکەش، بە ئینگلتەرا، جوانی ئەبەخشێت.

لە فەرەنسا لە ساڵی ١٦٨٥ کەمایەتی کالڤینی سەرکوت کران، ناچاربوون کە بە کاتۆلیزم ڕازی بن، یان دەرئەکران. بەڵام ئەم مەسەلەیە بە کوێ گەییشت؟ لەو سەردەمەدا بیرمەندی ئازادیخواز پیێر بێڵ لەو پەڕی هەڵسوڕانی خۆیدا بوو و لە ساڵی ١٦٩٤ ڤۆڵتێر لەدایك بوو. بەهۆی کەڵەگایی و زۆردارییەکانی لویسی چواردەهەمەوە، بۆ بۆرژوازی فەرەنسا ساناتر بوو، کە شۆڕشەکەی خۆی بە شێوەیەکی نا ئایینی و بەشێوەی شۆڕشێکی سیاسی پەتی، کە تەنها شێوەیەکی گونجاو بوو لە تەك دۆخی بۆرژوازی پەرەگرتوودا، جێبەجێ بکات. لە جیاتی پرۆتستانتەکان، بیرمەندانی ئازادیخواز چوونە نێو کۆمەڵە نیشتمانییەکانەوە. ئەمەش یانی، مەسیحییەت لە دوا تاقی خۆیدایە. ئیتر ئایین ئەو توانایییەی لەدەستدا، کە پۆشاکی ئایدیۆلۆژی بۆ تێکۆشانی هەر چینێکی پێشکەوتنخواز دەستەبەر بکات و زیاتر و زیاتر بووە موڵکی چینە سەردەستەکان بە تەنها، کە وەك ئامرازێکی فەرمانڕەوایی و بۆ لغاوکردنی چینە ژێردەستەکان بەکار

ئەهێنرا. لەم میانەدا هەر چینێك لە چینە دەسەڵاتدارەکان ئایینی تایبەتی خۆی بەکارئەهێنا: خانەدانە ملکدارەکان_ ژزوئیتیزمی کاتۆلیك یان ئەرتەدۆکسی پرۆتستانی، بۆرژوازی لیبراڵ و ڕادیکاڵ_ ڕاسیۆنالیزم (rationalism، عەقلانییەت). پێویستە ئەوەش بڵێین، کە ئایا ئەم بەرێزانە بڕوایان بە ئایینەکەی خۆیان هەیە یان نا، ئەوە مەسەلەیەکە، لە پراکتیکدا هیچ بایەخێکی نییە.

بەم جۆرە ئەبینین کە، ئایین لە دوای پەیدابوونییەوە هەمیشە، پارێزگاری لە زەخیرەیەکی دیاریکراو لەو وێنایانەی کە لە سەردەمەکانی ڕابردووەوە بەجێماوە، ئەکات، چونکە نەریت لە تێکڕای مەیدانە فیکرییەکاندا، هێزێکی کۆنەپارێزی مەزنە. وەلێ ئالوگۆڕێك کە بەسەر ئەم زەخیرەی وێنایانەدا دێت، دەرئەنجامی پەیوەندییە چینایەتییەکانە، واتە، پەیوەندییەکانی ئابووری نێوان تاکەکان، کە ئەم ئالوگۆڕانە پێکدەهێنن. لێرەدا ئیتر ئەوەندە بەسە.

لەو ڕوونکردنەوانەی سەرەوەدا، تەنها ئەوەندە لە توانادا بوو، کە باسێکی گشتیی دەربارەی تیۆری مارکس لە مێژوودا، بخەینە ڕوو، ئەوپەڕەکەی بە هەندێك نموونە، ڕۆشنیان بکەینەوە. بەڵگەی ڕاست و دروستی ئەم تیۆرییە تەنها لە مێژوودا ئەکرێت بۆی بگەڕێیت، مافی ئەوەم هەیە لێرەدا من بڵێم، کە لە دانراوەکانی دیکەدا، بە ڕادەی پێویست لەم جۆرە بەڵگانە باسکراوە. بەڵام تیۆری مێژوویی مارکس لە مەیدانی مێژوودا، زەبرێکی کوشندەی لە فەلسەفە دا، ڕێك بەو جۆرەی کە تێگەییشتنی دیالێکتیکی لەمەڕ سروشت، هەر جۆرە فەلسەفەیەکی بۆ سروشت، بە کارێکی ناپێوست و نەشیاو گۆڕی. ئێستا، چ لێرە و چ لەوێ، ئەرکەکە بریتی نییە لەوەی کە پەیوەندییەکان لە هزردا وەك داهێنان دابهێنین، بەڵکوو بریتییە لە





دۆزینەوەی ئەم پەیوەندییانە لە خودی واقیعەکان. بەم پێیە، ئەوەی کە ئێستا بۆ فەلسەفەی ڕاوەدونراو لە سروشت و لە مێژوودا ماوەتەوە تەنها، جیهانی ئەندێشەی ڕووتە، ئەویش تا ئەو جێگایەی کە ئاوەها جیهانێك هێشتا لە ئارادایە. ئەم جیهانە بریتییە لە: زانستی یاساکانی خودی پرۆسەی بیرکردنەوە، مەنتیق و دیالێکتیك.

★ ★ ★

لە پاش شۆڕشی ساڵی ١٨٤٨، ئەڵمانیای "ڕۆشنبیر" دەستی لە تیۆری کێشایەوە و چووە نێو چالاکی عەمەلییەوە. پیشەی بچوك و مانیفاکتۆرە کە پشتیان بە کاری دەستی ئەبەست، جێگایان بۆ پیشەسازی گەورەی ئەم سەردەمە چۆلکرد. ئەڵمانیا دووبارە بۆ نێو مەیدانی بازاڕی جیهانیی گەڕایەوە. ئیمپراتۆریەتی نوێی ئەڵمانیای بچوك (٢١)، لانی کەم گەورەترین ئەو ئاستەنگانەی کە بەهۆی لە ئارادابوونی ژمارەیەکی زۆری دەوڵەتی بچوك، پاشماوەکانی فیۆدالیزم و بیرۆکراسی، ئەهاتنە بەردەم ڕێگای پەرەسەندنی، لەنێوبرد. لێ بەو ڕادەیەی کە سپێکولاسیۆن (speculaton، مضاربة) بیرۆی فەیلەسوفەکان بەجێئەهێڵێ و لە بۆرسەی دراو ڕووگەیەك بۆخۆی بنیاتئەنێ، بەو ڕادەیەش ئەڵمانیای ڕۆشنبیر، ئەو بایەخە زۆرەی کە بە تیۆری ئەدات، کە لە دەورانی ئەو پەڕی زەلیلی سیاسی خۆیدا، مایەی شانازی ئەو بوو، یانی بایەخدان بە لێکۆڵینەوەی زانستیی ڕووت، بەدەر لەوەی دەرئەنجامە کردارەکییەکەی بە کەڵکە یان نا، لەگەڵ مۆڵەتی پۆلیسدا دژایەتی هەیە یان نا، لەدەستئەدات. ئەوە دروستە کە سروشتناسی فەرمیی ئەڵمانی، بە تایبەت لە بواری توێژینەوە تایبەتییەکاندا، لە ئاستی سەردەمەکەیدایە، بەڵام بە

پێی ئەو تێبینییە بە جێیەی کە گۆڤاری ساینس (Science)ی ئەمریکایی کردوویەتی, سەرکەوتنە یەکلاکەرەوەکان لە مەسەلەی توێژینەوە لە پەیوەندییە مەزنەکانی نێوان دیاردە (فاکت) جوداکان و بە گشتیکردنی ئەم دیاردانە لە چوارچێوەی یاساکان, ئێستا ئیتر بە پێچەوانەی پێشتر, نەك لە ئەڵمانیا, بەڵکوو زۆرتر لە ئینگلتەرا, ئەنجام ئەدرێن. بەڵام سەبارەت بە زانستەکانی مێژوو و لە نێویاندا فەلسەفەش, پێویستە بگوترێت, کە ڕۆحی کۆنی توێژینەوەی تیۆریی, کە لە هەمبەر هیچ شتێك ڕانەدەوەستا, هاوشانی فەلسەفەی کلاسیکی, بە تەواوەتی لەنێوچوو. فەلسەفەی ئیختیاریی بێمایە و ئاراستە ترسنۆکانە بۆ پلەوپایە و سود و قازانج, تەنانەت جێخواز (وصولي) بە نزمترین شێوەی, شوێنی گرتەوە. نوێنەرانی فەرمی ئەم زانستە, بوونە بیرمەندانی ئاشکرای بۆرژوازی و ئەو دەوڵەتەی کە لە ئارادایە, ئەمەش لە سەردەمێکدا, کە ئەم دوانە هەردوك, دوژمنی ئاشکرای چینی کرێکارن.

تەنها لە نێو ڕیزەکانی چینی کرێکاردایە کە, هێشتاکوو بایەخی ئەڵمانی بۆ تیۆریی هەر بەردەوامە و نابڕێتەوە. لێرەدا ئیتر هیچ هێزێك ناتوانێت, بیکاتە دەرەوە. لێرەدا هیچ جۆرە چاوبڕینێك بۆ پلەوپایە و سود و قازانج و پاراستنی بە بەزەییانە لە لایەن پلەوپایەدارەکانی سەرووەوە, لە ئارادانییە. بە پێچەوانەوە, بە هەر ڕادەیەك زانست, جەسورانەتر و لێبڕاوانەتر هەنگاو بنێ, بە هەمان ڕادەش لەگەڵ بەرژەوەندی و ئامانجەکانی کرێکاراندا جووت دێتەوە. ئەم ڕێبازە نوێیە کە لە مێژووی پەرەسەندنی کاردا, کلیلی تێگەییشتنی تێکڕای مێژووی کۆمەڵگای بەدەستهێناوە, هەر لە دەستپێکەوە چینی کرێکاری, بە پلەی یەکەم دواندووە و لە لایەن





ئەوەوە ئەو سۆزەی بەدییکردووە کە لە زانستی فەرمیدا, نە بۆی گەڕاوە, نە ئەو چاوەڕوانییەی لێی هەبووە. بزاڤی کرێکاریی ئەڵمانیی, واریسی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانییە.

لە ساڵی ١٨٨٦ لە لایەن ف. ئەنگڵسەوە نووسراوە. لە هەمان ساڵدا, لە گۆواری "Die Neue Zeit", لە هەردوو ژمارەی ٤ و ٥ بە چاپ گەییشتووە. پاشان لە ساڵی ١٨٨٨ لە شتوتگارت, بە شێوەی چاپێکی سەربەخۆ بڵاوکرایەوە.

# تێزەکان دەربارەی فۆیرباخ

## تێزی یەکەم:

کەموکوڕیی بنەڕەتی تەواوی ماتریالیزمەکانی هەتا ئێستا_ بە ماتریالیزمەکەی فۆیرباخیشەوە_ ئەوەیە کە، شت (Gegenstand)، واقیعییەت، دنیای هەستپێکراو، تەنها بە شێوەی بابەت (Objekt)، یان بە شێوەی تێڕامان (تەئەمول) (Anschauung)، بە زەین، درک دەکرێن، نەك بە شێوەی چالاکیی دیاریکراوی (موشەخەس) مرۆیی[20]. لێرەوە بۆمان دەرئەکەوێ، بە پێچەوانەی ماتریالیزمەوە، ئایدیالیزم پەرەی بە لایەنی پراکتیك داوە، بەڵام تەنها بە شێوەیەکی تەجریدیی، چونکە ئایدیالیزم، بەتەبیعەتی حاڵ، چالاکیی واقیعیی دیاریکراو، وەك ئەوەی کە هەیە، ناناسێت. فۆیرباخ بابەتە کۆنکرێتەکانی ئەوێ، کە لەڕاستیدا جودایە لە بابەتە فیکرییەکان، بەڵام خودی چالاکی مرۆیی، وەك چالاکییەکی بابەتیی و واقیعی (gegenständliche) نابینێت. هەر بۆیە، لە پەڕاوەکەیدا (کرۆکی مەسیحییەت)، جگە لە چالاکی تیۆریی، هیچ شتێکی تر، بە چالاکیی تەواوی بەشەریی، چاولێناکات، لە کاتێکدا

20 انسانی، بشری(بە فارسی). (و. کوردی).





ناڕوانێتە پراتیك و دیاری ناکات، مەگەر لە شێوە بازرگانییە پیسەکەیەوە[21] نەبێت. هەر بۆیە، گرنگیی چالاکیی ((شۆڕشگێڕانەی))، ((ڕەخنەیی_ عەمەلیی))، هەست پێ ناکات.

## تێزی دووەم:

مەسەلەی ئەوەی کە ئایا، بیرکردنەوەی مرۆیی، ڕاستییەکی بابەتییە (gegenständliche) یان نا، بە هیچ جۆرێك، مەسەلەیەکی تیۆریی نییە، بەڵکوو مەسەلەیەکی عەمەلییە. پێویستە مرۆڤ لە پراکتیکدا، حەقیقەت بسەلمێنێت، یانی واقیعیبوون و بەهێزیی بیرکردنەوەی و هەبوونی (Diesseitigkeit)[22] ئەم بیرکردنەوەیە، لەم دنیایەی ئێمەدا. مشتومڕکردن لەسەر واقیعیبوون و نەبوونی بیرکردنەوەی دابڕاو لە پراکتیك، مەسەلەیەکی سکولاستیی[23] پەتییە.

## تێزی سێیەم:

21 لە سەرەتایەك، کە لە نووسراوە فارسییەکەدا، بۆ تێزەکان نووسراوە، ئەڵێت کە، فۆیرباخ بە مانای ((پیسی جولەکە)) دەی ڕوانییە چەمکی ((کار/ پراکتیك))، یانی بە مانای پارەپەیداکردن، بەو جۆرەی کە جولەکەکان ئەیکەن. (و. کوردی).

22 ئەم وشەیە لە دەقە عەرەبییەکەدا لە بەرامبەر "هەبوون" و لە دەقە فارسییەکەدا لە بەرامبەر "بیرکردنەوەدا هاتووە، بەڵام ئەم وشەیە لە ئەڵمانییدا بە مانای: (دنیا، ئەم لایەنە)، دێت. کە بەرامبەر هیچ یەکێك لە وشەکانی ئەو دوو دەقە نایەتەوە. پێشەکینووسی وەرگێڕاوی فارسی ئەڵێت: لە دەقە ئەسڵییەکەدا، وشەی "ئەم لایەنەی بیرکردنەوە"ش هاتووە. (و. کوردی).

23 "scholastic" وشەیەکی ئینگلیزییە، بە مانای مەدرەسی، مەکتەبی یان مەکتەبگەرا، دێت. کلامیە (لە دەقە عەرەبییەکەدا). اخوندی (لە دەقە فارسییەکەدا). (و. کوردی).

تیۆری[24] ماتریالیستیی، کە پێی وایە، خەڵك بەرهەمی هەلومەرج و پەروەردەیە و لەو بڕوایەدایە کە بۆ گۆڕینی خەڵك، پێویستە هەلومەرج و پەروەردە بگۆڕدرێت، ئەوە فەرامۆش ئەکات، کە ئەوە خودی خەڵکە، هەلومەرج ئەگۆڕێت و ئەوە خودی پەروەردەکەرە، کە پێویستی بە پەروەردە هەیە. لە ڕوانگەی تیۆرێکی ئاوەهاییەوە بە ناچار، کۆمەڵگە ئەبێتە دوو بەشەوە، کە یەکێك لەو دوو بەشە، لە خودی کۆمەڵگە باڵاترە (بۆنموونە، لەلای ڕۆبەرت ئەوین).

بەراوردکردنی گۆڕانی هەلومەرج و چالاکیی مرۆیی، یان ئاڵوگۆڕی خۆبەخۆ، تەنها لە ڕووی پراکتیکی شۆڕشگێڕانەوە دەتوانرێت لێی بڕوانرێ و بە شێوەیەکی عەقلانی درکی پێ بکرێت.

## تێزی چوارەم:

فۆێرباخ لەو واقیعەوە دەستپێئەکات کە ئایین، مرۆڤ لە خودی خۆی دوورئەخاتەوە[25]، لەسەر ئەم بنچینەیە، جیهان ئەکاتە دوو بەشەوە: جیهانێکی ئایینیی خەیاڵی و دنیایەکی واقیعی[26]. کاری ئەو لەو چوارچێوەیەدایە کە، جیهانی ئایینی لە دنیای واقیعیدا کە پایەی جیهانی ئایینییە، لەنێوبەرێت[27]. ئەو، لەوە بێ ئاگایە کە، هەر کاتێك ئەم کارە

24 doctrine، عقیدە، مژهب، مسلك. (و. کوردی).

25 مرۆڤ بە خۆی نامۆ دەبێت. (و. کوردی).

26 لە پەراوێزی دەقە فارسییەکەدا هاتووە ئەڵێت: لە وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەدا، وشەی secular بە مانای غەیرە دینی، یان دنیایی، بەکار هاتووە. (و. کوردی).

27 جیهانی ئایینی ڕابکێشێتەوە بۆ بناغە زەمینییەکەی (بەپێی دەقە عەرەبییەکە). (و. کوردی).



تەواو بوو، ئەوا مەسەلەی بنەڕەتی هەر وەك خۆی ماوەتەوە[28]. لە ڕاستییدا، دنیای واقیعی، خۆی جیائەکاتەوە لەخودی خۆی و بە وێنەی قەڵەمڕەوێکی[29] سەربەخۆ، خۆی لای هەورەکان جێگیر ئەکات. ئەم جیاکردنەوەیە، تەنها لەسەر بنچینەی کێشە و ناکۆکییە دەروونییەکانی دنیای واقیعی، ئەشێ شی بکرێتەوە. کەواتە پێویستە، یەکەم: جیهان، لە ناکۆکییەکانی خۆیەوە درك بکرێت، تاوەکوو بتوانرێت دواتر، (جیهان/ و. کوردی) بە شێوەی شۆڕشگێڕانە و بەڕێگای لابردنی ئەو ناکۆکییانە، ئاڵوگۆڕی بەسەردا بهێنرێت. بۆ نموونە، هەروەکوو زانیمان کە خێزانی زەمینی، ڕاز و نهێنیی خێزانی ئاسمانییە[30]، ئیتر ئەبێ ڕەخنەی تیۆری لە خودی خێزانی زەمینیی بگیردرێت و بە پراتیك، ئاڵوگۆڕی شۆڕشگێڕانەی بەسەردا بهێنرێت.

## تێزی پێنجەم:

فۆێرباخ، کە بە بیرکردنەوەی ڕووت[31] ڕازی نەبوو، پەنای بۆ تێڕامانی هەستیی (حسی) ئەبرد، بەڵام جیهانی هەستپێکراوی وەك بەرهەمی پراکتیکی دیاریکراوی مرۆڤ نەدەبینی[32].

28 لە دەقە فارسییەکەدا ئەڵێ: "ئەو بێئاگایە لەوەی کە بەم کارەش، هێشتا مەسەلەکە بە هێز و توانای خۆیەوە، لە شوێنی خۆیدا ماوەتەوە". (و. کوردی).

29 لە دەقە عەرەبییەکەدا ئەڵێ: "بە وێنەی مەلەکوتێکی سەربەخۆ"، وشەی "ملکوت"، یانی: الملك العقیم، شا، شاهەنشا، ئیمپراتۆر، قەراڵ. (و. کوردی).

30 لە دەقە عەرەبییەکەدا دەستەواژەی "العائله المقدسه/ خێزانی پیرۆز"، بەکار هاتووە. (و. کوردی).

31 التفکیر المجرد. اندیشه انتزاعی (بە فارسی). (و. کوردی).

32 لە دەقە عەرەبییەکەدا ئەڵێت: بەڵام جیهانی هەستپێکراوی، وەك چالاکیی عەمەلی هەستەکانی مرۆڤ، دا نەئەنا. (و. کوردی).





## تێزی شەشەم:

فۆێرباخ ئەگەرچی کرۆکی ئایینیی, لە کرۆکی مرۆیی دەتوێنێتەوە, بەڵام [ئەوە لەبەرچاوناگرێ] کە کرۆکی مرۆیی, کارێکی دابڕاو لە دەروونی تاکی مرۆیی جودا لە تاکەکانی دیکە, نییە[٣٣]. لە ڕاستییدا, ئەم کرۆکە بۆخۆشی, کۆی تەواوی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە[٣٤].

فۆێرباخ, کە ڕەخنە لەم کرۆکە ڕاستەقینەیە ناگرێت, ناچار ئەبێت کە:

١. ڕەوتی مێژوو لەبەرچاو نەگرێت و بەپێی ئەو گریمانەیەی کە تاکی مرۆیی دابڕاو و جودا لە یەکتر, لە ئارادایە, وا دەڕوانێتە هەستی ئایینی (Gemüt)[٣٥], کە شتێکی لەگۆڕانەهاتووە و خۆی بۆخۆی لە ئارادایە. ٢. سەرئەنجام, کرۆکی مرۆیی[٣٦] تەنها بە وێنەی "جۆر" بە وێنەی شتێکی یەکپارچەیی دەروونیی کەر, کە هەڵگری پەیوەندیی ڕووتی سروشتی تاکەکانن بە یەکترییەوە, لەبەرچاو دەگرێت.

## تێزی حەوتەم:

33 لە دەقە عەرەبیەکەدا ئەڵێ: "بەڵام کرۆکی مرۆیی, شتێکی موجەڕەدی جیاوەنەبوو لە تاکی دابڕاو, نییە". (و. کوردی).

34 لە دەقە فارسییەکەدا ئەڵێ: "لە ڕاستیدا ئەم کرۆکە بۆخۆشی, کۆمەڵێك لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە". (و. کوردی).

35 لە دەقە فارسییەکەدا, دەستەواژەی "ڕۆحی دینی" بەکار هاتووە, بەڵام وشەی "Gemüt" کە لە دەقە عەرەبییەکەدا هاتووە, بە زمانی ئەڵمانی یانی, هەست, سۆز و عاتیفە. (و. کوردی).

36 لە دەقە فارسییەکەدا, دەستەواژەی "وجود بشری" بەکار هاتووە و وەرگێڕەکەی لە پەراوێزدا ئەڵێ: "ئاوەڵناوی مرۆیی" لە لایەن ئەنگڵسەوە, بۆی زیاد کراوە. (و. کوردی).





بە پێی ئەوە, فۆێرباخ, ئەوە نابینێ کە ((هەستی ئایینیی)) بۆخۆشی, بەرهەمی کۆمەڵایەتییە و تاکی ڕووتی مرۆیی کە ئەو (یانی, فۆێرباخ/ و. کوردی) شی ئەکاتەوە, لە ڕاستیدا, بە شێوەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراوەوە, پەیوەستە.

## تێزی هەشتەم:

هەرجۆرە زیندەگییەکی کۆمەڵایەتیی, لە ناوەڕۆکدا, پراکتیکە. ڕیگەچارەی ژیرانەی هەموو نهێنییەکان کە تیۆریی لە سۆفیگەریی دوور بخاتەوە, لە پراکتیکی مرۆیی و تێگەییشتن لەو پراتیکە, سەرچاوەی گرتووە.

## تێزی نۆیەم:

بالاترین بەرئەنجامێك کە ماتریالیزمی تەئەمولیی, یانی ماتریالیزمێك کە چالاکیی هەستەکان[٣٧] بە چالاکیی پراتیکی دانانێت, پێی بگات, ئەوەیە کە, چالاکی هەستەکان, شێوە تەئەمولی تاکەکانی دابڕاو لە یەکتری ((کۆمەڵگای مەدەنی))[٣٨]ن.

37 لە دەقە عەرەبییەکەدا زاراوەی "الحساسیە" بەکار هاتووە, بەڵام لە دەقە فارسییەکەدا, دەستەواژەی "فعالیت حواس" بەکار هاتووە. (و. کوردی).

38 لە پەراوێزی دەقە فارسییەکەدا ڕوونکرنەوەیەك هاتووە ئەڵێت: دەستەواژەی ((کۆمەڵگای مەدەنی)) لە سەرەتادا, لە سەدەی هەژدەیەم, لە لایەن نووسەرانی ئینگلیزەوە بەکار هێنراوە. پاشان, لە لایەن تیۆریسینەکانی فەرەنسا و دواتریش لە لایەن هیگڵەوە بەکار هاتووە. لە ئەڵمانیا ((کۆمەڵگای مەدەنی)) (کۆمەڵگا بە بێ دەوڵەت), لە بەرامبەر ((کۆمەڵگای سیاسی)), جێگیر ببوو. مارکس, خوازیاری کۆمەڵگای مرۆیی (کە لە دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی پێکدێت) بوو. (و. کوردی).

## تێزی دەیەم:

**دیدگای ماتریالیزمی کۆن, ((کۆمەڵگای مەدەنی))[39]یە. دیدگای ماتریالیزمی نوێ, کۆمەڵگای مرۆیی, یان مرۆڤایەتییە, کە خەسڵەتی کۆمەڵایەتیبوون, تایبەتمەندییەتی[٤٠].**

## تێزی یانزەیەم:

**فەیلەسوفەکان, بێجگە لە شیکردنەوەی جیهان بە شێوازی جۆراوجۆر, کارێکی دیکەیان نەکردووە, بەڵام قسە لەسەر گۆڕینێتی.**

[39] لە سەرەتایەك کە لە نووسراوە فارسییەکەدا بۆ تیزەکان نووسراوە, هاتووە: لە ڕوانگەی مارکسەوە, ماتریالیزمی نوێ, خوازیاری ((کۆمەڵگای مرۆیی)) (کۆمەڵگایەك کە تیایدا سیاسەت, دەوڵەت و چینەکان, لە ئارادایە)ە. مارکس ((کۆمەڵگای مەدەنی))ی ماتریالیزمی کۆنی ڕەتئەکردەوە, چونکە لە((کۆمەڵگای مەدەنیدا)), ڕۆڵی دەوڵەت و سیاسەت ڕەتئەکرایەوە. (و. کوردی).

[40] لە دەقە فارسییەکەدا, دەستەواژەی "بشريت اجتماعی" بەکار هاتووە. (و. کوردی).





*** کارڵ مارکس, لە بەهاری ساڵی ١٨٤٥دا نووسیویەتی. ئەنگڵس, بۆ یەکەم جار, لە ساڵی ١٨٨٨ وەکوو پاشکۆی پەرتووکەکەی ((لودڤیگ فۆیرباخ و کۆتایی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی)) بڵاوی کردۆتەوە.**

*** بە پێی دەقی چاپی ١٨٨٨, کە لەگەڵ دەسنووسەکەی مارکس بەراوورد کراوە, دەرهاتووە.**

**وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە.**

## تێبینییەکـــان:

١. "تۆفان و هێرش", بزووتنەوەیەکی وێژەیی کۆمەڵایەتیی بۆرژوازیی ئەڵمانی, لە ساڵەکانی ٧٠- ٨٠ی سەدەی هەژدەیەم بوو. ئەم بزووتنەوەیە وەکوو ڕابوونێکی وێژەیی ڕەسەن کە نوسەرە لاوەکانی ئەڵمانیا لە دژی نیزامی فیۆداڵی ستەمکار پێی هەستان, دەرکەوت.

٢. "نۆیێ تزایت" "Die Neue Zeit" (سەردەمی نوێ), گۆڤارێکی تیۆریی سۆسیال دیموکراتەکانی ئەڵمانیا بوو, لە ساڵەکانی ١٨٨٣- ١٩٢٣ لە شتوتگارت دەرئەکرا. لە ١٨٨٥- ١٨٩٥ " Die Neue Zeit" هەندێك وتاری ئەنگڵسی بڵاو ئەکردەوە. ئەنگڵس بە ئامۆژگارییەکانی, کۆمەکی زۆری بە دەستەی دەرهێنەری گۆڤارەکە ئەکرد و هەر کاتێك لە مارکسیزم لایان بدایە, بە توندی ڕەخنەی لێ ئەگرتن. لە سەرەتای نیوەی دووەمی نەوەتەکان, لە پاش مەرگی ئەنگڵس, ئەم گۆڤارە بە بەردەوامی وتاری لادەرانی بڵاو ئەکردەوە.

٣. مەبەستی ئەنگڵس تێبینییەکانی "هاینە"یە دەربارەی "شۆڕشە فەلسەفییەکانی ئەڵمانیا" کە لە وتارەکانی ساڵی ١٨٣٣, لە ژێر ناوی "دەربارەی مێژووی ئاین و فەلسەفە لە ئەڵمانیا" باس کراوە.

٤. "زیۆس", بەهێزترین خودای ئۆلۆمپییە بەپێی ئەفسانەی کۆنی یۆنانی.

٥. پییەتیست, لایەنگرانی ڕەوتی ئایینی لە کڵێسەی لۆتەریی کە لە نێو بۆرژوازی سەر ڕاین و لە فیستفالیا بڵاو بوو.



٦. "دۆیتشە یاربیوخێر فیور ڤیزینشافت ئوند کونست" " Deutsche Jahrbücher für Wissenschaft und Kunst" (ساڵنامەی ئەڵمانی زانست و هونەر), ئۆرگانی هیگڵییە لاوەکان کە لە ساڵی ١٨٤١ تا ١٨٤٣ لە لایەن ا. ڕوگە و ئیشتیرمیر بەڕێوە ئەبرا.

٧. "ڕاینیشە تزایتونگ" "Rheinische Zeitung" (ڕۆژنامەی ڕاینی), ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی ڕادیکاڵ بوو, لە ١٨٤٢- ١٨٤٣ لە کۆلۆنیا دەرئەچوو. لە ١٥ی ئۆکتۆبەری ١٨٤٢ هەتا ١٨ی مارسی ١٨٤٣ لە لایەن مارکسەوە دەرئەهێنرا.

٨. مەبەستی ئەنگڵس پەڕاوەکەی ماکس شتیرنەر (نازناوی "کاسپار شمیدت"ە)ە بە ناونیشانی "تاقانە و خووەکانی", کە لە ساڵی ١٨٤٥ بڵاوبۆوە.

٩. پەڕاوەکەی فۆێرباخ "کرۆکی مەسیحییەت" لە ساڵی ١٨٤١ لە لایپزیك بڵاوبۆوە.

١٠. مەبەست لە هەسارەی "نیبتۆن"ە کە لە ساڵی ١٨٤٦ لە لایەن "یوهان گالە" کە لە دیدەبانخانە (مرصد/ و. کوردی)ی بەرلین دیدەبان بوو, دۆزرایەوە.

١١. لێرەدا مەبەست سەدەی هەژدەیەمە.

١٢. تیۆری فلۆژیستۆن, تیۆرێکی ساختە بوو لە کیمیادا, لە سەدەکانی هەڤدەیەم و هەژدەیەم بڵاو بۆوە, بە پێی ئەم تیۆرە, سوتان بەهۆی بوونی مادەیەکی تایبەتی نێو تەنەکان, کە پێی ئەڵێن فلۆژیستۆن, ڕوئەدات.





١٣. ئاماژەیە بەو هەوڵەی ڕۆبسپیر، کە بۆ جێگیرکردنی ئایینێکی نوێ بە ناوی "بوونەوەری باڵا"وە، دای.

١٤. دەستەواژەیەکی زۆر بڵاوی نێو پۆپۆلیستەکانی بۆرژوازی ئەڵمانیا بوو، کە لە پاش سەرکەوتنی پروسەکان لە سادوا (لە جەنگی نەمسا و پروسیا ساڵی ١٨٦٦) بڵاوبۆوە. ئەمەش بەو مانایە دێت کە گوایە، سەرکەوتنی پروس بەرئەنجامی باڵایی سیستەمی پەروەردە و فێرکردنی گشتی پروسییە.

١٥. ڕادامانت، بەپێی ئەفسانە یۆنانییەکان، بە بۆنەی بەدادی خۆیەوە، لە دۆزەخ بە دادوەر دامەزرێنرا.

١٦. لێرەدا مەبەست شۆڕشی ١٨٤٨- ١٨٤٩ی بۆرژوا دیموکراتیکی ئەڵمانیایە.

١٧. گەڕانەوەی پاشایەتی ١٨١٤- ١٨٣٠، قۆناغی دووەمی فەرمانڕەوایەتی بنەماڵەی بۆربۆنەکانە لە فەرەنسا، شۆڕشی یۆلیۆ (تەموز) ١٨٣٠ نیزامی کۆنەپەرستی نەوەکانی بۆربۆن، کە نوێنەری بەرژەوەندییەکانی خانەدان و ئیکلیریکییەکان بوو، تێکوپێك دا.

١٨. ڕێنێنسانس، قۆناغێکە لە پەرەسەندنی ژمارەیەك لە وڵاتەکانی ڕۆژئاوای نێوەڕاست، لە مەیدانی ڕۆشنبیری و ئایدیۆلۆژیدا. ڕێنێنسانس بە گەشەسەندنی پەیوەندییەکانی سەرمایەدارییەوە بەسترابۆوە و نیوەی دووەمی سەدەی پانزەیەم و سەدەی شانزەیەمی گرتەوە. هەروەکوو باوە، قۆناغی ڕێنێنسانس بە گەشانەوەی بە گوڕی هونەر و زانست و بایەخدان بە فەرهەنگی جیهانی کۆن (هەر لێرەوەش ناوی ئەم قۆناغە هاتووە)، ئەلکێنرێت. ئەنگڵس لە



سەرەتای پەڕاوەکەی "دیالێکتیکی سرووشت"دا، ستایشی ڕێنانسانسی کردووە.

١٩. کۆڕی نیقایی (٣٢٥ی زایینی)، کۆڕێکی ئایینی سەربە کڵێسە بوو، لە شاری نیقا لەسەر بانگهێشتی قوستەنتین ئیمپراتۆری ڕۆمانی کۆبوونەوە. ئەم کۆڕە "یاسای باوەڕ"، کە بە شێوەیەکی کورت بیروباوەڕی کڵێسای مەسیحی تیادا نووسرابوو، دانا. بەپێی فەرمانی ئیمپراتۆر، ئەبێ هەموو مەسیحییەکان بە "یاسای باوەڕ"ەوە پەیوەست بن، دانپێدانەنانی، هەروەکوو تاوانی دژی دەوڵەت چاو لێ ئەکرێ و سزا ئەدرێت.

٢٠. ئالبیژییەکان (لە ناوی شاری ئالبی باشوری فەرەنساوە هاتووە)، تیرەیەکی ئاینی بوون، لە سەدەکانی ١٢- ١٣ ڕابەرایەتی بزووتنەوەی دژی کڵێسای کاتۆلیکی ڕۆمانیایان ئەکرد.

٢١. زاراوەیەکە بە مانای ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی (بە بێ نەمسا) دێت، کە لە ساڵی ١٨٧١ لە ژێر ڕابەرایەتی پروسیا هاتە کایەوە.

*

## رێنمای ناوەکان:

- ئابیان لە ئەسکەندەرییەوە (سەدەی دووەمی زایینی), نوسەری پەڕاوی "مێژووی ڕۆما".
- ئەنگڵس فریدریك (Engels) (١٨٢٠- ١٨٩٥), ڕابەر و مامۆستای پرۆلیتاریا, برادەری کارل مارکس و هاوڕێی فیکر و تێکۆشانی بوو. بە هاوبەشی لەگەڵ مارکس تیۆری کۆمۆنیزمی زانستیی دانا, لە پێناوی ڕزگاریی چینی کرێکار و کۆمۆنیزمدا خەباتی کرد.
- ئۆوین (Owen) ڕۆبێرت (١٧٧١- ١٨٥٨), سۆسیالیستێکی یۆتۆپی ئینگلیزی مەزن بوو.
- باکۆنین میخائیل ئەلیکسەندرۆفیتش (١٨١٤- ١٨٧٦), نوێنەرێکی هەڵکەوتووی ئەنارشیستەکان و نەیاری مارکسیزم بوو.
- باوێر برونۆ (١٨٠٩- ١٨٨٢), نوسەرێکی سیاسی ئەڵمانی و سەربە هیگڵییە چەپەکان بوو.
- بایل (Bayle) بییر (١٦٤٧- ١٧٠٦), فەیلەسوفێکی گومانگەرای فەرەنسی بوو.
- پرۆدۆن (Proudhon) بییر یۆسیف (١٨٠٩- ١٨٦٥), نوسەرێکی سیاسی فەرەنسی, ئابوریناس و زانایەکی کۆمەڵایەتی سواو





(vulgar, مبتذل, سوقي, دارج), بیرمەندێکی وردەبۆرژوا, دامەزرێنەرێکی ئەنارشیزم, بوو.

- بلان (Blanc) لویس (١٨١١- ١٨٨٢), سۆسیالیستێکی وردەبۆرژوای فەرەنسی بوو.
- بوخنێر (Büchner) لودڤیگ (١٨٢٤- ١٨٩٩), پزیشکێکی ئەڵمانی, لە پەخشکارانی زانستی سروشتی بوو. لە فەلسەفەدا ماتریالیستێکی سواو, بوو.
- بۆربۆن, خێزانێکی پاشایەتی فەرەنسییە, فەرمانڕەوایەتی فەرەنسایان لە کۆتایی سەدەی شانزیەم هەتا ١٧٩٢ و لە سەردەمی گەڕانەوە (١٨١٤- ١٨٣٠) کردووە.
- بێرتێلۆت (Berthelot) مارسیلین (١٨٢٧- ١٩٠٧), کیمیاگەرێکی فەرەنسی و دانەری یەکەمین ئاوێتەی مادە ئۆرگانیکییەکانە.
- تییر (Thiers) ئادۆلف (١٧٩٧- ١٨٧٧), مێژوونووس و سیاسەتمەدارێکی بۆرژوازی فەرەنسی و ئەشکەنجەگەرێکی کۆمۆنەی پاریس بوو.
- تییری (Thierry) ئۆگستان (١٧٩٥- ١٨٥٦), مێژوونووسێکی لیبراڵی فەرەنسی بوو.
- داروین (Drwin) چارلس (١٨٠٩- ١٨٨٢) زانایەکی مەزنی ئینگلیز, بنیاتنەری زانستی بایۆلۆژی ماتریالیستی, داهێنەری تیۆری نەشونمای جۆرە پەرەسەندووەکان, بوو.

- ديتزگين (Dietzgen) يۆسيف (١٨٢٨- ١٨٨٨), فەلسەفەكارێكى ماترياليستى پرۆليتێرى ئەڵمانى, ئەندامى يەكێتى كۆمۆنيستەكان, كرێكارى دەباخانە, بوو.
- ديدرۆ (Diderot) دنيس (١٧١٣- ١٧٨٤), فەلسەفەكارێكى فەرەنسى دەركەوتوو, نوێنەرى ماترياليزمى ميتافيزيكى, يەكێك لە بيرمەندانى بۆرژوازى شۆڕشگێڕى فەرەنسى لە سەدەى هەژدەيەم, ڕۆشنگەر, سەرۆكى ئينسكلوپيدييەكان, بوو.
- ديكارت (Descartes) ڕينى (١٥٩٦- ١٦٥٠), فەلسەفەكار و ماتماتيكزانێكى فەرەنسى دەركەوتوو, لە فەلسەفەدا فەلسەفەكارێكى دووانەيى (dual, ثنائي), لە فيزيا ماترياليستێكى ميكانيكى, بوو.
- ڕۆبسپير (Robespierre) ماكسيميليان (١٧٥٨- ١٧٩٤) تێكۆشەرێكى دەركەوتووى شۆڕشى بۆرژوازى فەرەنسى لە كۆتايى سەدەى هەژدەيەم, ڕێبەرى ياقوبييەكان, سەرۆكى حكومەتى شۆڕشگێڕ لە ١٧٩٣- ١٧٩٤, بوو.
- ڕۆسۆ (Rousseau) جان- جاك (١٧١٢- ١٧٧٨), ڕۆشنگەرێكى فەرەنسى دەركەوتوو, ديموكراتخواز, بيرمەندێكى وردەبۆرژوازى, فەلسەفەكارێكى بڕوادار بە بوونى خودا وەك ئافرێنەرى جيهان, بوو.
- ڕێنان (Renan) ئەرنست (١٨٢٣- ١٨٩٢), فەلسەفەكارێكى ئايدياليستى و مێژوونووسێكى فەرەنسى, نووسەرى توێژينەوە لە مێژووى ئايينى مەسيحى, بوو.





- شتاركە (Starcke) كارڵ نيكۆلاى (١٨٥٨- ١٩٢٦), فەلسەفەكار و كۆمەڵناسێكى دانيماركى بوو,
- شتراوس (Strauss) داڤيد (١٨٠٨- ١٨٧٤), لە لايەنگرانى هيگڵييە چەپەكان بوو, نوسەرى پەڕاوى "ژيانى يەسوع"ە, كە بە شێوەيەكى مێژوويى, ڕەخنە لە ئينجيل ئەگرێت.
- شتيرنێر (Stirner) ماكس, ناوى خوازراوى گاسبار شميدت (١٨٠٦- ١٨٥٦)ە, لە لايەنگرانى هيگڵييە چەپەكان و تيۆريسينێكى ڕێبازى تاكگەراى بۆرژوازى ئەنارشيستى بوو.
- شيلێر (Schiller) فريدريك (١٧٥٩- ١٨٠٥), شاعيرێكى مەزنى ئەڵمانى بوو.
- گالە (Galle) يوهان گۆتفريد (١٨١٢- ١٩١٠), گەردووناسێكى ئەڵمانيى بوو, لە ساڵى ١٨٤٦ هەسارەى "نيبتۆن"ى دۆزييەوە.
- گرون (Grün) كارڵ (١٨١٧- ١٨٨٧), نووسەرێكى سياسى ئەڵمانى بوو, يەكێك بوو لە نوێنەرانى ئەوانەى ناو ئەبران بە "سۆسياليستە ڕاستەقينەكان".
- گۆتە (Goethe) يوهان ولفگانگ (١٧٤٩- ١٨٣٢), شاعير و بيرمەندێكى مەزنى ئەڵمانى بوو.
- گيزۆ (Guizot) فرانسوا (١٧٨٧- ١٨٧٤), مێژوونوسێكى بۆرژوازى فەرەنسى, كەسايەتييەكى دەوڵەتكار (رجل الدولة)ى لايەنگرى پاشايەتى, بوو.

- فریدریك ولهیلمی سێیەم (١٧٧٠- ١٨٤٠)، پاشای پروسیا (١٧٩٧- ١٨٤٠) بوو.
- فریدریك ولهیلمی چوارەم (١٧٩٥- ١٨٦١)، پاشای پروسیا (١٨٤٠- ١٨٦١) بوو.
- فۆێرباخ (Feuerbach) لودڤیك (١٨٠٤- ١٨٧٢)، فەلسەفەكارێكی ماتریالیستی و ئاتەئیست (atheist) و ئەڵمانییەكی دەركەوتوو بوو. ماتریالیزمی فۆێرباخ سەرباری تەنگەبەری و خەسڵەتی تەئەمولی، یەكێك بوو لە سەرچاوەكانی تیۆری فەلسەفەی ماركسی.
- فۆگت (Vogt) كارڵ (١٨١٧- ١٨٩٥)، ماتریالیستێكی سواوی ئەڵمانی، دوژمنێكی سەرسەختی بزووتنەوەی كرێكاری و كۆمۆنیستی، لە لایەنگرانی بۆناپارت، بوو.
- ڤۆڵتێر (Voltaire) فرانسوا ماری (ئەرواى) (١٦٩٤- ١٧٧٨)، گەورەترین ڕۆشنگەری فەرەنسی سەدەی هەژدەیەم، نووسەر و فەلسەفەكار، بوو.
- كانت (Kant) ئەمانوئیل (١٧٢٤- ١٨٠٤)، فەیلەسوفێكی ئەڵمانی دەركەوتوو، بنیاتنەری فەلسەفەی كلاسیكی ئەڵمانی، ئایدیالیستێكی خۆیی و نازانمگەر (agnostic، لا ئەدری)، بوو.
- كالفین (Calvin) جان (١٥٠٩- ١٥٦٤)، بیرمەندێكی بزووتنەوەی ڕیفۆرمیستی ئایینی لە سویسرا بوو.
- كۆپ (Kopp) گیرمن فرانز (١٨١٧- ١٨٩٢)، كیمیاگەرێكی ئەڵمانی بوو.





- كۆپێرنیك نیكۆلای (١٤٧٢- ١٥٤٣)، گەردوونناسێكی مەزنی پۆلۆنییە، دامەزرێنەری ئەو سیستەمەیە كە دەڵێت، ڕۆژ ناوەندی جیهانە.
- لامارك (Lamarck) جان باتیست (١٧٤٤- ١٨٢٩)، سروشتناسێكی فەرەنسی، بەر لە داروین سەربە ڕێبازی پەرەسەندن بوو.
- لوتەر (Luther) مارتین (١٤٨٣- ١٥٤٦)، بنیاتنەری ئایینزای پرۆتستانتی (لوتەریست) بوو لە ئەڵمانیا.
- لوڤیریە (Leverrier) ئۆربان ژان ژۆزیف (١٨١١- ١٨٧٧)، گەردوونناسێكی فەرەنسی بوو.
- لویسی چواردەیەم (١٦٣٨- ١٧١٥)، پاشای فەرەنسا (١٦٤٣- ١٧١٥) بوو.
- ماركس (Marx) كارڵ (١٨١٨- ١٨٨٣)، دامەزرێنەری بلیمەتی كۆمۆنیزمی زانستیی و مامۆستا و ڕابەری مەزنی پرۆلیتاریای جیهانی بوو.
- مۆلێشۆت (Moleschott) جاكوب (١٨٢٢- ١٨٩٣)، زانایەكی فیزیۆلۆژی هۆڵەندی، نوێنەری ماتریالیزمی سواو، بوو.
- مینیە (Mignet) فرانسوا ئۆگوست (١٧٩٦- ١٨٨٤)، مێژوونووسێكی بۆرژوازی فەرەنسیی سەر بە باڵی لیبراڵی بوو.
- ناپلیۆنی یەكەم (بوناپارت) (١٧٦٩- ١٨٢١)، ئیمپراتۆری فەرەنسا (١٨٠٤- ١٨١٤، ١٨١٥)بوو.
- هۆبس (Hobbes) تۆماس (١٥٨٨- ١٦٧٩)، فەیلەسوفێكی ماتریالیستیی دەركەوتووی فەرەنسیی بوو.

- هیگڵ (Hegel) جۆرج ولهیلم فریدریك (١٧٧٠- ١٨٣١)، فەیلەسوفێکی گەورەی ئەڵمانی، ئایدیالیستێکی بابەتی و دیالێکتیکی، گەورەترین نوێنەری فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی، بوو.
- هاینە (Heine) هنریخ (١٧٩٧- ١٨٥٦)، شاعیر و نووسەرێکی سیاسی گەورەی ئەڵمانیا بوو.
- هیوم (Hume) داڤید (١٧١١- ١٧٧٦)، فەیلەسوفێکی ئینگلیزی، ئایدیالیستێکی زاتی، نازانمگەر، بوو.









وەرگێڕانی "لودڤیك فۆیرباخ و کۆتایی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی" بۆ زمانی کوردی, لەم سەرچاوانەوە بووە:

_ لودفيغ فورباخ ونهاية الفلسفة الكلاسيكية الالمانية, فريدريك انجلس, دار التقدم, موسكو ١٩٧١. ترجمة: الياس شاهين.

_ لودويك فورباخ و پايان فلسفه كلاسيكى المانى, فريدريش انگلس, ترجمه محمد پورهرمزان, انتشارات حزب تودەايران.

www.tudehpartyiran.org

وەرگێڕانی "تێزەکان دەربارەی فۆیرباخ" بۆ زمانی کوردی, لەم سەرچاوانەوە بووە:

_ لودفيغ فورباخ ونهاية الفلسفة الكلاسيكية الالمانية, فريدريك انجلس, دار التقدم, موسكو ١٩٧١. ترجمة: الياس شاهين.

_ تزهايى دربارەى فويرباخ, كارل ماركس, ترجمه: باقر پرهام, پيشگفتار: م. رازى, بازنويس: ياشار اژرى.

http://www.javaan.net/nashr.htm







# پێرست







